دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی زماننناسی
(٢)

# ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز



# لەگەڵ



## ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری
## لەدیالێکە ناوەندی یەکانی
## زمانی کوردی‌دا

نووسینی
دکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی زمانناسی
( ٢ )

# ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز
# لەگەڵ
# ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری
# لە دیالێکتە ناوەندی یەکانی
# زمانی کوردی دا

نووســـــینی
دکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

بەغدا - ١٩٨٠

# الجملة المركبة التي يكون أحد أجزائها تابع للجزء الآخر مع الجملة التابعة الوصفية في اللهجات المركزية للغة الكردية

تأليف

الدكتور ابراهيم عزيز ابراهيم

بغداد – ١٩٨٠

# پێشکەش ...

- بە باوکی نەمرم لە مەزاری تەنگ‌و تاریکیدا ، بە دایکی دڵسوزم ، کە بە نەخوێندەواری خۆیانەوە وەك خوێندەوارێکی لیهاتوو هەر پێیاندەوتم کورِم خوێندن ... هەر خوێندن‌و هەر خوێندن ...
- بەو زاناو رێزمان نووسانی بەرز ، کە هەر دەم نووکی خامەیان لە پێناوی زانستی زمان بە وردی دەخولایەوەو دەخولێتەوە .
- بەزاناو رێزمان نووسانی کوردو غەیری کورد ، کە لە عاستی رێزمان‌و زانستی زمانی کوردییەوە شتێکیان نووسیووە .
- بەو خوێندکارانەی ، کە لە سووچەکانی رێزمان‌و زانستی زماندا خۆیان مەڵاس‌داوەو بەوانەش ، کە خۆیان بۆ ئەو سووچانە تەرخان‌کردووە .

# پێشەکی

ئەم کارەی بەردەست ، کارێکی زانستیە لە رووی کۆڵینەوە لە بابەتێکی سینتاکس لە رێزمانی کوردیدا •

ئەم کارە زانستیەم لە کاتی خۆیدا لەسەر شێوەی نامەی دکتۆرا خستە بەردەم ئەنجوومەنی زانایانی زمان لە ئامۆژگای رۆژ ـ هەڵات ناسیدا سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتەوە • زۆر بە پێویستم زانی ، کە بە زووترین کات وەری گێڕمە سەر زمانی کوردی ، تا بە زمانی کوردیش بکەوێتە بەردەست زاناو رێزمان نووسانی کوردمان ، بۆ ئەوەی ئەوانیش بە وردی بخوێننەوەو ڕای پوختی خۆیان بنێرنە هاریکاریم ، تا بتوانم لە بەرهەمی داهاتوودا قوولتر بچمە بنجو بنەوانی تێکرای سینتاکس زمانی کوردی • وە هەروەها بۆ ئەوەش ، کە بەڕێزان نووسەرانی رێزمان هاوکاریم بکەن لە دانانی رێزمانێکی زانستی تەواو بۆ زمانی کوردی ، کە ئەم کارە بەردی بناغەی سووچێکیەتی لەگەڵ بەردی بناغەی ئەوان تەلاری بەرزو قەشەنگی رێزمانی کوردی دروست بکرێت •

ئەوەی شایانی باسیشە ئەوەیە ، کە من بەپێی توانا دەسکارییەکی زۆری کارەکەم کردووە . دەسکاریەکە بریتیە لە زیادکردنی چەند نموونەیێکی تر و خستنە پاڵ نموونەکانی خۆی، وە هەروەها سەیرکردنی چەند سەرچاوەیێکی تر بۆ فراوانکردنەوەو پێشخستنی باری تیۆری کارەکە ، وە هەندێ شتی ترم خستۆتە سەر ئامرازی گەیەنەر « کە » . وەپتر لێدواوم(١) .

وفەرهەنگۆکێکی زانستیم خستۆتەسەر .

**دکتۆر**
**ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم**
**بەغدا : ١٩٧٨/٩/٢٠**



---

(١) بەراوردی لەگەڵ کارەکەم بکە بە زمانی رووسی .

Ибрагим А. И.Сложноподчиненное предложение с придаточным определительным в центральных диалектах Курдского Языка, Москва-; ×,˙.

# سەرەتا

ئەم لێکۆلینەوەی سینتاکسی زمانی کوردی لەگەڵ زمانە ئێرانیەکانی تردا بەراوردبکەین ، وەکو زمانی فارسی ، تاجیکی ، ئۆردۆ ، پشتو .... هتد . بۆمان دەردەکەوێت ، کە ئەم بابەتەی گراماتیك لە زمانی کوردیـدا تائێستا نەبۆتە باسێکی سەربەخۆ . لە هەموو ئەو کارە زانستیانەدا ، کـە سەبارەت بەگراماتیکی زمـانی کـوردی نووسـراون لـە گشت کتێبەکانی گراماتیکی کوردیشدا ، کـــە لەبابەت سینتاکی کوردیەوە چـەند شتێکیان نووسیووە تەنیا چاوپێخشاندنێکی گشتیمان بەرچاوە دەکەوێت . تەنانەت نوسینێکیدوورو درێژو سەربەخۆیان سەبارەت رستەی لێکدراو و رستەی ئاوێتەش تێدا نیە . هەروەها سەبارەت رێگاو شێوەی دروسـتکردنو بنیاتنانی ئەمجۆرە رستانەش لێکۆلینەوە کەمەو لێدوانێکی زۆر باوبلاویش دەربارەی پەیوەندیە گراماتیکیەکانی راناوی گەیەنەرو سینتاکسی رستەی شوێن کەوتووش نیە .

ئەو زاناو رێزمان نوسانەی ، کە تا ئێستا لەسەر سینتاکسی کوردیان نووسیبووە لە بێگانەو خۆمالی بە رۆژهەلاتناس و کوردشناس زانایانیزمانو نوسەرانی رێزمانی کوردی ، ئەم بەرێزانەن :

ك . ك . کوردۆێف ( قەناتێ کوردۆ ) ، ج . خ . بەکاێیف ، ك . ر . ئەیوبی ـ ی . ئا . سمیرنۆڤە ، نوری عەلی ئەمین ، ئەحمەد حەسەن ، محەمەد

ئەمین هەورەمانی ، گیوی موکریانی ، ئێرنست مەکارۆس ، د، ن، مەکێنزی ، کەمال بەدلی ، جەلادەت بەدرخان ، ر • لێسکۆت ، مستەفا خورەم دل ، ل • ۆ • فۆسووم ، س • ب سۆوەن ، ر • جاردین ، سەعید سدقی کابان ، یو، یو، ئەڤالیانی ، ماوریزۆ گارزۆنی ، فێردیناند یوستی ، ئۆسکارمان •

ك • ك • کوردۆیێڤ لە کارە زانستیەکانی خۆیدا ( زمانی کوردی ، مۆسکو ، ١٩٦١ ، بەرووسی[1] ، گراماتیکای بەراوردی زمانی کوردی ، مۆسکۆ، ١٩٦٨ بە روسی[2]، رێزمانی زمانی کوردی، مۆسکۆ - لێنینگراد - ١٩٥٧ بە روسی)[3] سەبارەت هەندێ لە مەسەلەکانی سینتاکسی کوردی دواوە ، کـــە تیایدا بایەخی هـــەرە گرنگی بە دیالێکتی کرمـانجی ســەروو ( کرمـانجی ) داوە • پرۆفیسۆری بـەرێز لەکارەکانیدا واتـای ئامـرازی پەیوەستو ئامرازی گەیەنەر باس‌دەکات ولـە هەردوو بەشەکانی رستە - پلەی یەکەمو پلەی دووەم - دەدەوێت • هەروەها دەربارەی ئیزافەتیش دەدوێتو دەڵێت : ئیزافەت لە زمانی کوردیدا دەتوانێ رستەی شوێن‌کەوتوو بە رستەی سەرەکیەوە بلکێنێ • سەرەرای ئەوەش دەڵێت • لە زمانی کوردیدا تەنیا ئیزافەت رستەی شوێن‌کەوتوو بە رستەی سەرەکیەوە نالکێنێت ، بەڵکوو هۆی تریش هەن وەك : ئامرازەکانی گەیەنەرو راناوی نسبەتداری نیشانە •

چ • خ بەکایێڤ لە کتێبە گراماتیکیەکانی خۆیدا ( ووتارێکی کورتی رێزمانی زمانی کوردی - لـە فەرهەنگی کوردی - روسیدا ، مۆ ســکۆ ،

---

1)Курдоев К. К. Курдский Язык, Москва, 1961.

2) Курдоев К. К. Сравнительная Граматик Курдского Языка, Москва, 1968.

3) Курдоев К. К. Грамматика Курдского Языка, М-л; 1957.

١٩٥٧ ، بە ڕووسی )[1] لەبابەت ڕستەی سادەوە لە زمانی کوردیدا ـ دیالێکتی کرمانجی سەروو ـ دەڵێت پەیوەستی هاوبەندایەتی سینتاکسی لـە ڕستەی زمانی کوردیدا ، بە.: ( ڕیکەوتنی بەشەکانی ڕستە)[2] ، ( ڕێچکەی واتـای ڕستە )[3] ، ( پێکەوەنووسان )[4] پێك دێت •

سەبارەت ڕستەی لێکدراویش بـە تایبەتی ڕســـــتەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازو ڕستەی لێکدراوی پەیوەستدار دەدوێ ـ وە دەربارەی بەیەکەوە ـ لکاندنو بەیەکەوە نووساندی ڕستانیش زانای ناوبراو دەڵێت ، لەزمـــانی کوردیدا ڕســـتەی ســـادە لەنێو ڕستەی لێکدراوی پەیوەستداردا بە ئەمرازەکانی پەیوەست بە یەکەوە دەلکێن • لەبارەی شوێنکەوتووکانیشەوە نـاوی شەش جـۆر لـــە ڕستەی شوێنکەوتوو دەبـات وەك : ڕســتەی شوێنکەوتووی دیارخەری ، بەرکاری ، مەرجی ، کاتی ، ئامانجی ، هۆیی[5] • وە بـاسی ئامرازەکانی گەیەنەرو ئەو ڕاناوانەش دەکات ، کـــە هاریکاری ئامرازەکانی گەیەنەر دەکەن لـــە لکاندنی ڕستە شوێنکەوتووەکاندا بـــە ڕستەی سەرەکیەکانەوە لە نێو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا •

بـــە لێکۆڵینەوە لـە ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازو ڕستەی لێکدراوی پەیوەســـتدار پرۆفیسۆر چ • خ بەکاییف گەیشتۆتە ئـەوە ، دەتوانرێ ئـەو جـــۆرە ڕستانە بەبێ ئامرازیش بـــە ڕستەی سەرەکیـەوە بەسترێنەوە ـ واتە دەتوانین بڵێین ، کە لە زمانی کوردیشدا ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازو ڕستەی لێکدراوی پەیوەستداری بێئامرازیش هەیە •

---

1) Бакаев Ч. Х. Очерк грамматики Курдского Языка- Курдско-Русский словар- Москва, 1957.

(٢) بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم کارە .
(٣) بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم کارە .
(٤) بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم کارە .
(٥) بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم کارە .

نووســـەری بـــەڕێز لەسەر ئەمـــە دەڕوات و دەڵێت : ڕستەلێکـــدراوە شوێن کەوتووخوازەکانو ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارە بێ ئامرازەکای لـــە زمانی کوردیدا بە زۆری لـــە گفتوگۆکردنداو لـە ئاخافتنی ناو خەڵکیـدا بەدەردەکـەونو دەبیسترێن • ســـەرەڕای ئەمـــەش لێکـدراوی شـــوێن کـەوتووخوازی بێ ئامراز بـــە زۆری ئەو جۆرە ڕستانە دەگرێتەوە کــــە لـە ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری و بەرکاری و ئامانجی دروست • بونیە•

ك • ر • ئەیوبیـــی • ئا • سمیرنۆڤە لەکتیبەکەیاندا ( دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ، ١٩٦٨ بە ڕوسی )[1] بە کورتی باسی چـەند بابەتێکی سینتاکسی دەکەن ، وەکو ڕستەی سادەو لێکدراوو ئاوێتە • لە ڕســـتەی لێکدراویشدا سەبارەت ڕستە لێکدراوەکانی شوێن کەوتووخوازو ڕستە لێکدراوەکانی پەیوەســـتداردەدوێن • ســـەرەڕای ئەمانەش باسی پلـەکانی یەکەمو دووەمی بەشەکانی ڕســـتەو ئامرازەکانی گەیەنـەرو ئامـرازەکانی پەیوەست دەکەن لە ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازداو چەند جۆرێکی نیشاندەدەن • وەك : ڕســـتەی شوێن کەوتووی موبتـەدایی ، خـــەبەری ، دیارخەری ، بەرکاری ومەرجی و ئامانجی و ئاوەڵکاری و هۆیی • وە وای ڕووندەکەنەوە ، کـــە زۆربەی ڕستە شوێن کەوتووەکان • وەك ڕســـتەی شوێن کەوتووی موتیەداری ، خەبەری ، بەرکاری ، دیارخەری و ئاوەڵکاری و ئامانجی بە هۆی ئامرازی گەیەنەر « کە » بە ڕستەی سەرەکیەوە دەلکێن لەنێو ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا •

نووســـەرانی دیالێکتی کـــوردی موکـری دەڵێن، هـــەندێ لـــە ڕستە شوێن کەوتووەکانی تر وەك : دیارخەری و ئامانجی دەتوانن بە بێ ئامـرازی گەیەنەریش خۆیان بە ڕستەی سەرەکیەوە ببەستنەوە لە ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازدا •

---

1) Эейюби К. Р. Смирнова И. А.Курдский диалект Мукри. Ленинград, 1968.

نوری عەلی ئەمین لە کتێبەکانی ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، قواعیدی زمانی کوردی لە سەرفەو نەحودا،بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨)لە ڕستەی لێکدراوو ئاوێتەو بەشەکانی دەدوێت • دەربارەی ڕستەی لێکدراو سێ جۆری لێباس‌دەکات وەك ، ڕستەی شـــوێن‌کەوتووی بەرکاری ، ئاوەلکاری‌و دیارخەری •

لەبارەی لکاندنی ئەم جۆرە ڕستە شوێن‌کەوتووانە شەوە دەلێ بەیارمەتی ( ی ، ی‌کە ، کـــە ) بـــە ڕستەی سەرەکیەوە دەبەسترێنەوە لەنێو ڕستەی لێکدراوی‌شوێن‌کەوتووخوازدا • بەلام من رام وایە ، کـە ( ی ، ی‌کە ) ئامرازی گەیەنەر نین ، بەلکو ( ی ) هی ئیزافەیە • ( ی ) ئیزافەتیش لـــە زانستی زمانداوە لە زانستی زمانە ئێرانیەکانیشدا بـــە ئامراز دادەنرێت • هەرچەندە دەشتوانێ دوو ڕستە بە ڕستە شوێن‌کەوتووی دیارخەرەوە لە نێو ڕستەیەکەوە ببەستێتەوە ، کە بریتین لە ڕستەی سەرەکی و لێکدراوی شوێن‌کەوتووخواز • هەروەها (ی‌کە )ەش ناتوانێ ببێ بە ئامرازی گەیەنەر، کە لە ( ی ) و ( کە ) پێك‌هاتووە •

ئیرنست مەکارۆس لە کتێبەکەیدا

A Kurdish Grammar descriptive analysis of Kurdish of Sulaimaniya-IRAQ, New York, 1958.

. گۆڤەری ناوچەی سلێمانی کردۆتە مەیدانی باس‌و لێکۆلینەوەی خۆی و بەشێکی تایبەتیشی بۆ سینتاکسی ئەو گۆڤەرە تەرخان‌کردووە ، کە تێدا باسی چەند بابەتێکی سینتاکسی دەکات ، وەك بەشەکانی لێکدراو و ئاوێتە • ئینجا سەبارەت لکاندنی ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری گەیشتۆتە ئەو ئەنجامە، کە ئەم جۆرە ڕستەیە بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەر ( کە )و ( ی ) ئیزافەت بە ڕستەی سەرەکیەوە دەلکێت لەناو ڕستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا •

د. ن. مەکەنزی لە بەرهەمەکەیدا

Kurdish dialect studies - 1, London, 1962

سەبارەت سینتاکسی کوردی دواوە • ئەوەی شایانی باسە نووسەری بەڕێز نەك تەنها باسی هەردوو دیالێکتەکانی کوردی وەك دیالێکتی کرمانجی سەروو و خواروو ، بە بەڵکوو لە گۆڤەرەکانی ئەم هەردوو دیالێکتماتەش دواوە • ئەم لە باسەکەیدا بایەخی هەرەزۆری بەو ئامرازە گەیەنەرانە داوە ، کە رستەی دیارخەریو مەرجی بە رستەی سەرەکیەوە دەلکێنن • وەك ئامرازە گەیەنەرەکانی ( کە ، کو ، ئەگەر ) •• سەرەڕای ئەوەش پتر باسی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری کردووە • نووسەری بەڕێز ئەوەشی دیارخستووە ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لەنێو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا دەتوانێ بەهۆی ( ی ) ئیزافەتو ئامرازی گەیەنەر (کە) بە رستەی سەرەکیەوە بلکێن • هەروەها لە کتێبەکەیدا باسی بەشەکانی رستەش دەکات • وەك : موبتەداو خەبەرو بەشەکانی •

کەمال بەدلی لە شاکارەکەیدا ( ڕێزمانی کوردی ، ئەنقەرە ، ۱۹٦٥ ، بەتورکی )[1] دوابەشی بۆ سینتاکس تەرخان کردووە • لێرەدا لە رستەو بەشەکانی دەدوێ ، وەك رستەی لێکدراوو ناوی فرمانیو موتبەداو خەبەر•

جەلادەت بەدرخانو ر • لێسکۆت لە کتێبەکەیاندا
Kurda - dialect Kurmaji, Paris, 1970 - Grammaera
، کە بە زمانی فەرەنسی نووسیوویانە • لە سینتاکسی کوردی دواونو دیالێکتی کرمانجی سەروویان ( کرمانجی ) کردۆتە مەیدانی لێکۆڵینەوەیانو بە کورتی لە رستەی سادەو لێکدراوو جۆرەکانی رستە دواون •

مستەفا خورەم دلیش لە کتێبە ڕێزمانیەکەیدا ( صرف دستور زبان کردی ، تبریز ، ۱۳٤۷ك ، بە فارسی ) سەبارەت رستەی سادەو لێکدراو دەدوێت • هەروەها باسی ئامرازی پەیوەستو گەیەنەر دەکاتو چەندانێکی

1- Kemal Bedeli Kurdçe Grammare, Ankere, 1965

لێ‌خستوونەتە بەرچاوو وەك : ( وا ، ئەوتۆ ، کە چی ، چە ، بەڵام ) من رام وایە ئەوەی ئامرازی گەیەنەر بێت لـەم کۆمەڵەدا تەنها ( کـە )ەیە ، ئەگینا ئەوانی‌تر هەریەکە بۆ جۆرە بابەتێکی کەی رێزمانی کوردی بەکاردێت • بۆ نموونە : ( چی ، چە ) راناوی نادیارن • ( ئەوتۆ ) ئاوەڵکاری جۆری‌یە بۆ حالەت دەربڕین بەکاردێت هەندێك جار دەتوانێ بچێتە سەر ئامرازی گەیەنەر ( کە ) بەتایبەتی لەو کاتە بەکاردەهێنرێ کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بە رستەی سەرەکیەوە دەبەستێتەوە لە نێو رستەی لێکدراوی شوێن کـە ـ وتووخوازدا •

ل • فۆسووم لە پەرتووکە رێزمانیەکەیدا

A Practical Kurdish Grammar, Minneopolis, 1919

چەند لاپەڕەیێکی بۆ سینتاکس تەرخان‌کردووە ، کە باسی بەشەکانی رستە دەکات ، بەتایبەتی رستەی سادەو لێکدراو • دەربارەی رستەی لێکدراوەوە دەڵێت : لە زمانی کوردیدا ئامرازی ( کە ) دەتوانێ دوو رستە بـە یەکەوە ببەسـتێتەوە • نووسـەر ئـەم رایەی خۆی بە بەڵگەو نموونـە روونو دووپات‌کردۆتەوە • سـەرەڕای ئەوەش باسی موبتەداو خەبەری رسـتەش دەکاتو کورتە باسێکیشی دەربارەی فرێز ( ئیدیوما ) لـە زمانی کوردیـدا پیشان‌داوە • ل • ۆ • فۆسووم ئەمانەی لە رووی رێزمانەوە لێکداوەتەوە •

ی•ب• سۆون لە نامیلکەکەیدا

Grammar of the Kurdish Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913

بە کورتی دەربارەی هەندێ لە حاڵەتەکانی سینتاکسی کوردی دەدوێت‌و لـە باسەکەدا تێکستی لـە هـەردوو دیالێکتە باوەکانی زمانی کـوردی بەکارهێناوە وەك دیالێکتی کرمانجی خواروو سەرو •

محەمەد ئەمین هەورەمانی لە ( سەرەتاییك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ )دا بەشێکی بۆ سینتاکسی کوردی تەرخان کردووە ، کە تێدا بە درێژی لە دروستکردنو بنیاتنانی رستەو جۆرەکانی رستەی سادەو رستەی شوێنکەوتووی نێوان رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز پیشانداوە ، کە ئەمانەن : رستەی شوێنکەوتووی مەرجیو هەندێکی تر . سەبارەت ئامرازەکانی پەیوەستو گەیەنەریش قسەی کردووە لە لای نووسەری بەرێز ئامرازەکانی پەیوەست ئەمانەن (ئەنجا لەپاشا ، بەلام ) ئامرازەکانی گەیەنەریش بریتین لە ( کەوا ، کەی کە ئەگەر ) بەڕای ئێمە لە ئامرازی « کەوا »دا تەنها ( کە ) ئامرازی گەیەنەرەو ( وا )ش کە لەگەل گەیەنەر ( کە )دا هاتووە ، نە بەشێکە لە ئامرازەکەو نە پاشگرێکیشە بۆ دروستکردنی ئامرازی لێکدراو وەك لێرە بە پێشەوە باسمکردن ؛ بەلکو ئەم « وا »یە ، کە دەکەوێتە پاش ئامرازی گەیەنەر « کە » دەوری خۆی تەنها لە بەتینکردنی هاوبەندایەتیو پێکەوەلکلندنی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بە رستەی سەرەکیەوە لەنێو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو - خوازدا دەبینێ ؛ واتە لە دەربڕینی ( کەوا ) هەرکە ( کە ) ئامرازی گەیەنەرەو ( وا ) هیچ پەیوەندییەکی لێرەدا بە ئامرازی گەیەنەری ناوبراوەوە نیە(١) .

گیوی موکریانی لە ( تعلم اللغة الكردية ، اربيل ، کۆلکەزێرینە ، هەولێر ١٩٦٦ ) باسی دروستو بنیاتنانی رستەی سادە دەکاتو چەند نموونەیەکیش لە رستەی لێکدراوو ئاوێتە دەخاتە پێشچاوو وە بەبێ نموونە هێنانەوەش کومەلێك ئامرازی گەیەنەر و پەیوەست پێشاندەدات باسەکەی مامۆستا گیو هەر بۆ فێرکردنی بێگانانە بە زمانی کوردی .

(١) بڕوانە لقی رۆلی ئامرازی گەیەنەر ل (٦٠) .

سەعید سدقی کابان لە پەڕاوە ڕێزمانیە بەنرخەکەیدا مختصر صرفو نحوی کوردی ، بغدا ، ١٩٢٨ ) بە زۆری باسی مەرفە لۆگیا دەکات لە زمانی کوردیدا • زۆر کەمی دەربارەی سینتاکس نووسیووە • لەوەی ، کە نووسیوویەتیشی پتر باسی ئامرازەکانی گەیەنەرو پەیوەست دەکات • بە کورتیش لەسەر رستەکانی زمانی کوردی دەدوێت ، بە تایبەتی لەسەر جۆری رستەکان و بەشەکانی •

و• جاردین لە باسە ڕێزمانیەکەیدا

Bahrinan Kurmanji, Baghdad, 1922

لەچەند پرسیارێکی سینتاکسی کوردی ـ دیالێکتی کرمانجی سەروو گۆڤەری بادینانی ــ دواوە ، بەتایبەتی دەربارەی بنیاتنانو دروستکردنی رستە • نوسەری بەڕێز بە کورتی وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوەو بە نموونەی کوردیش روونیان دەکاتەوە •

یو • یو • ئەڤالیانی سەبارەت سینتاکسی کوردی شتی کەمە • ئەوەی لەم رووەوە نووسیوویەتی تەنها فرازە لۆژیایە لەگەڵ سینتاکس فرمانی لێکدراو • لەکتێبی ( کەرستەی فرمانی لێکدراوی زمانی کوردی ، سەمەرقەند ، ١٩٦٢ بەڕوسی )[1] •

ماوریزۆ گارزۆنیش لە کتێبەکەیدا

Grammatica e vocabolario langue Kurda, compostidal p., Roma, 1787

بە زمانی ئیتالی • ئەم کتێبە لە رووی زانستی زمانو گراماتیکی زمانی کوردی بە یەکەم کتێب دادەنرێت • لە کتێبەکەدا نووسینی دەربارەی سینتاکس کوردی زۆر کەمە • ئەوەی هەشە لە قەوارەی پیشاندانی چەند رستەییەکی سادەی کوردی دەرناچێت • ئەمەشی بۆ فێرکردنی زمانی کوردی بەکارهێناونو بەرچاو خستوون بەتایبەتی بۆ ئیتالیایەکان •

1) Авалиани Ю. Ю. Материалы по слотному глаголу Курдского Языка, Самаркент. 1962.

ئێرانشناسی بەناوبانگیش فێردیناند یوستی لە کارەکەیدا
Kurdish Grammatika S. p., 1880
چەند شتێکی دەربارەی سینتاکسی کوردیەوە نووسیووە ٠ لەم مەیدانەدا سەبارەت بنیاتنانو دروستکردنی رستەی سادەوە قسەی کردووەو نووسیوویەتی ٠

ئۆسکارمانیش لە بەرهەمەکەیدا
de mondart der mukri Kudan - 1 Berlin, 1959
کورتە باسێکی دەربارەی سینتاکس کوردیەوە نووسیووە ، لێرەدا بایەخی هەرە زۆری بە بەشەکانی رستەی سادە داوە ـ لە گۆڤەری موکری دیالێکتی کرمانجی خوارووبە نموونەوە سەبارەت ئەم جۆرە رستانە لە زمانی کوردیدا بە زمانی ئەڵەمانی دەدوێت ٠

ئەوەش شایانی باسە ، کە پاش ئەوەی ، لە کارەکەم بوومەوەو ٠

بە چەند مانگێك کۆمەڵێك کتێب بە زمانی کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی لە عاستی رێزمانی کوردیەوە لە لایەن هەندی نووسەرانی رێزمانی کوردی دەرچوون ، وەکو کتێبەکانی : رێزمانیکوردی ـ بە کوردی و بەعەرەبی ـ نووسینی ئەحمەد حەسەن ئەحمەد بەغدا ، ١٩٧٦، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، دانانی لێژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، چەند حەشارگەیێکی رێزمانی کوردی ، نووسینی مەسعود محەمەد ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ووشەی زمانی کوردی ، نووسینی دکتۆر ئاورەحمانی حاجی مارف، بەغدا، ١٩٧٥، زمانی کوردی لەبەر رۆشتایی فۆنۆتیکدا ، دکتۆر ئاورەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، چەند یاسایەکی بنجیی دارشتنی رستە لە زمانی کوردیدا، نووسینی وریا عومەر ئەمین، لەندەن، ١٩٧٦ بە ئینگلیزی[1]٠

1) Waria O. A. Some fundamental ruces of Kurdish Syntax structure, London, 1976

لە بەرهەمە ڕێزمانیەکەی بەڕێز ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لە لاپەڕەکانی ( ۱۷۲ ـ ۱۸۸ )دا چەند بابەتێکی سینتاکسی کوردی باس کردووە • وەنەبێ لە کارەکەدا نووسینێکی تایبەتی لە بارەی سینتاکسی کوردیەوە هەبێ • لەو چەند بابەتانەش ، کە باسی کردوون قسەی لەسەر ئامرازی گەیەنەر کردووە• نووسەر ناوی ئامرازی گەیەنەر دەبات بە ناوی گەیەنەرو دەڵێ : « ناوی گەیەنەر ـ اسم الموصول ـ ، ناوی گەیەنەری جیاوازە » • ناوی گەیەنەری جیاوازیشی کردووە بە سێ بەش • لەم ڕووەشەوە دەنووسێت ، « لە کوردیدا سێ ناوی گەیەنەر هەن وەك لە خوارەوە دەرخراون وە لە مانەش ناوی گەیەنەری یەکەمیان بۆ تاکە ودووەمیان بۆ کۆمەڵە وە سێیەمیان پێتەو دەگونجێ شوێنی یەکەمو دووەم بگرێتەوە وەیان بە تەنیا بەکاربێت • لێرەشدا مانای تاكو کۆمەڵ دەگەیەنێت ••»

بەڕێز ئەحمەد حەسەن ئەحمەد بەڕیزە دەربڕینیەکانی ( ئەوەی ) بۆ تاك داناوە ، ( ئەوانەی ) بۆ کۆ • هەردوکیشی بە ناوی گەیەنەر داناون • بەڵام بەڕای من ئەم دوو دەربڕینانە بە هیچ جۆر ئاواوبە تەنیا نابە ناوی گەیەنەر • هەردووکیان ڕاناوی نیشانەن بۆ دوور ، کە پێكهاتوون لە ( ئەوە +ی ) ، ( ئەوانە + ی ) ، کە بەهەمان شێوەش بۆ نزیك هەیەو پێكدێت لە ( ئەمە ، ئەمانە ) • جا گەر ( ئەوە ، ئەوانە ، ئەمە ، ئەمانە ) ڕاناوی نیشانە بن بۆ دوور و نزیك ، دەمێنێتەوە ( ی ) ئەم ( ی ) یەش ئیزافەتە ، کە لە حاڵەتی دوو ڕستە پێکەوەلکان دەردەکەوێت • بەلگەش بۆ ئەمە ئەمەیە کە ئەم ڕاناوانە دەتوانن بین بە بەش لە بەشەکانی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا • لە بارەی ئامرازی گەیەنەر « کە »شەوە نووسەری بەڕێز زۆر باش باسیکردووە • بەڵام ئەمەشیان ناوی گەیەنەر نیە، بەلکو ئامرازی گەیەنەرە ، کە دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە وەیان ڕستەی شوێنکەوتوو دەگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی • ئەم ئامرازە هەر بەتەنها

بەکاردێت نە بۆ تاکەوە نە بۆ کۆمەڵ ؛ بەواتە تاکو کۆمەڵی نیە • وە ناشتوانێ بیێتە بەشێك لە بەشەکانی ڕستەی سەرەکی[1] •

لە کتێبی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی » ، کە لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد دایناوە ، لە ، لاپەڕە ٣٢٦ ـ ٤١٨ بابەتێکی سینتاکسی بەرچاو دەکەوێت ، کـــە برێتیە لـە باس‌کردنی ئامرازی عـەتف ـ عطف Congection • ئەم ئامرازە لە رووی ئەوەی دوو رستە بەیەکەوە دە ـ بەستێتەوە بابەتێکی سینتاکسە • ئەوەی شایانی باســە ئەوەیە ، کـە ئـەم بەتەواوی‌و بەباشی روونکراوەتەوە ـ لەگەڵ ئەوەش لە باسەکەدا ناتەولوێتێك بەدی دەکرێت ، کە برێتیە لەوەی ، رۆڵی ئەم ئامرازە لە رستەدا باس نەکراوە؛ یانی لـە قالبی رســتەدا دانەرێژراوە ، بەڵکو وەکو ئامراز باس‌کراوە • وە لە ڕووی زاراوەوە بە ئامراز دانراون • ئەوەش جێگای باسە ، کە ئەم ئامرازانە لە رووی سینتاکسەوەدەکرێن بە دوو بەش ؛ ئامرازی پەیوەستدار و ئامرازی گەیەنەر •

لە لاپەڕە (٣٦٢)ش‌دا باسی چەند بابەتێکی وەیان حالەتێکی بەکارهێنانی ئامرازی گەیەنەر ( کە ) کراوە لە رووی گەیاندنی دوو رستە بەیەکەوە • لێرەشــدا باسی ئەم جۆرە رستانەش ناکەن ، کە بەیارمەتی ئەم ئامرازەوە بەیەکەوە دەلکێن • ئەم ئامرازە ش بە راناو دادەنێن لەهەمان لاپەڕەدا • بۆ ئەمەش وەکو بۆ ئەوانی تریش ووتوومە راناو نیە ، بەڵکو ئامرازە ، چونکە نابێتە بەشێك لە بەشەکانی رستە : گەر راناو بووایــە ، دەبووە بەشێکی رستە •

---

(١) أ ـ ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغداد ، ١٩٧٦
ب ـ بڕوانە رۆڵی ئامرازی گەیەنەر لەم کارەدا ، ل (٤٧) •

له کتێبی کۆڕی زانیاری کورددا ئەم ئامرازانە لێك‌جودا نەکراونەتەوە، بەڵکو بە تێکەڵاوی باسکراونو نووسراون • ئەبووایە ئامرازەکان بکرابان بە دوو بەشەوە ، وەك بەشی ئامرازی گەیەنەری وەکو ئامرازەکان ، کــە ، چونکە •••• هتد ، وە هەروەهاش ئامرازەکانی پەیوەستداری وەکو ، ش ، و ، بەڵام ••••• هتد[1] •

له شاکارەکەی بەڕێز مامۆستا مەسعود محەمەدیشدا ( چەند حەشارگە ـ یێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ )دا چ رووێکی سینتاکسی تێــدا نیە ، تەنانەت ئەمە نەبێ ، کە لەبارەی راناوەوە سوودێکی بۆ سینتاکسی هەیە ، چونکە راناوەکان لە کتێبەکەدا بەڕێکی باســـــکراون • راناوەکان دەبنە راناوی ناوی دیارخراو لە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەریدا •

له کتێبەکانی بەڕێز دکتۆر عەبدولرەحمان مەعروفدا ( ڕێزمانی کوردی لە بەر رۆشنایی فۆنوتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦، ووشەی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٥ )دا باس دەربارەی سینتاکسی نیە ، تەنها لە کتێبی ووشەی زمـانی کوردیدا نەبێ ، کە ووشە ناو بێ یان چاووگ دەتوانێ ببێتە ناوی دیارخراو لە ناو رستەی سەرەکیدا ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر •

کاك وریا عومەر ئەمین بە ناونیشانی (چەند یاسایەکی بنجی داڕشتنی رستە لە زمانی کوردیدا ، لەندەن ، ١٩٧٦ ، بە ئینگلیزی )[2] ووتـارێکی گـەورەی بڵاوکردۆتەوە • ئەوەی شایانی باســە کاك وریا لــە کارەکەیدا

---

(١) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ لێژنەی زمانو زانســـــتەکانی ـ کۆڕی زانیـــاری کورد ، بـەغـدا ، ١٩٧٦ ، لاپەڕەکانی : ٣٢٦ ـ ٤١٨ ، وە ل ٣٦٢ •

2) Waria O. A. Some fundamental ruces of Kurdish Syntax structure, London, 1976

سەرکەوتووەو باش بۆ مەسەلەی دارشتنی رستەی سادە رۆیشتووە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیووە بە شێوەیێکی قووڵو زانستیانە بچێتە بنجو بنەوانی رستە ، چونکە ووتارەکە رووی فراوانی گرتۆتە بەر نەك رووی قووڵبوونەوەو چوونە ناو ناخی دارشتن . لە بەر ئەوە کارەکەی وریا ووتارێکی سەرپێییە لە ئاست سینتاکسی زمانی کوردیەوە .

هەر بەم شێوەیەش کاکە وریا باسی رستەی لێکدراو دەکات لە ووتارەکەدا . لێرەشدا لە لاپەرە ( ٢٢ ، ٢٣ ) لە بارەی ( ی ) قسەی کردووەو دەڵێت ، ئەم ( ی )یە مۆرفێمە . بەڵی راستە مۆرفێمە گەر باس باسی فۆنۆتیك بێت ، بەلام گەر باس هاتە سەر سینتاکس ئەم ( ی )یە بە مۆرفێم ناهێتە باسکردن بەڵکو لە زانستی زمانانی ئێرانیداو لە زانستی زمانی کوردیش‌دا بە ئیزافەت باس‌دەکرێت‌و پێی‌دەوترێت ( ی ) ئیزافەت[1] .

منیش ، کە خاوەنی ئەم کارەم ، کە بابە تێکە لە بابەتەکانی سینتاکس ، بیرم لە هەڵبژاردنی ئەم کارە سینتاکسیەکردەوە ، بۆ ئەوەی بە سەرنجێکی زانستیانە وبەپێی تەرازووی زانستی زمان لێی بکۆڵمەوەو لێی‌بدوێم‌و

---

1) А. Арендес А. К. Кратки синтаксис современного персидского Литературского Языка. М. Л., 1941

ئەرێندس ئا.ك. کورتەیێکی سینتاکسی زمانی ئێمرۆی فارسی مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٤١

B. Mackenzie D. N. Kurdish dialect studiec. London, 1961

ج ـ مەسعوود محەمەد بەکارهێنانی (ی) لە زمانی کوردیدا ، بەغداد .

د ـ د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ شوێن کەوتووی دیارخەری لە دیالیکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردی ـ نامەی دکتۆرا ـ مۆسکۆ ، ١٩٧٥

Д. Ибрагим А. И. Сложно подчиненное предложение с придточных определительным в центральных диалектах Курдского Языка, М., 1975

ھەڵی سەنگێنم . ھەروەھا ھۆی ھەڵبژاردنیشی دەگەڕێتەوە سەر ئەمانەی خوارەوە :

١ ــ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لە زانستی زمانداو لە زانستی سینتاکسدا ھێجگار باوو بڵاوە ، چونکە لە نێو ئەم جۆرە رستانەدا زۆربەی زۆری وەڵامدانەوەیان چارەسەرکردنی ھەر پرسیارێك لە پرسیارەکانیدا رێگا گەلەك خۆش دەکات ، بۆ وەڵامدانەوەی یان چارەسەرکردنی جۆرەھا پرسیاری سینتاکسی بەتایبەتی وە گراماتیك بە گشتی .

٢ ــ لە زمانی کوردیدا رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری وەك بەشەکانی تری سینتاکس زۆر کەم باسکراوە . ئەو باسەی لەو رووەشەوە ھەیە کەم و کوڕی تێدایە . جا بۆ ئەوەی ئەم بابەتە گرنگەی سینتاکس باس بکرێت وبەپێی تواناش کەم و کوڕی و ناتەواویەکانی کەم بکرێنەوە ئەم بابەتەمان ھەڵبژارد .

٣ ــ نە سینتاکس خۆی وە نە رستەیێك لە رستەکانی ، وەك : رستەی ئاوێتە ، لێکدراو لێکدراوی شوێن کەوتووخواز ، لێکدراوی پەیوەستدارو رستە شوێن کەوتووەکانی تریش نەبوونەتە باسێکی سەربەخۆ . جا بۆ ئەوەی زمانی کوردیش ببێتە خاوەنی باسێکی تایبەتی لە زانستی سینتاکسدا ئێمە ئەم بابەتەمان ھەڵبژارد .

ئامانجیشم لە ھەڵبژاردن و لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەی سینتاکسی کوردی ئەوە بوو ، کە بتوانم بە رێگای رستەی شوێن کەوتووی دیارخەریەوە لە نێو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز ھەموو پرسیارەکانی سینتاکس و گرامانیکی زمانی کوردی چارەسەر بکەم و کتێبی گەورەی رێزمانی کوردی بنووسم بە فۆنێتیك و مەرفەلۆگیاو سینتاکسەوە .

لەمە زیاتر لە کارەکەی خۆم نادوێم • هەڵسەنگاندیشی لە لای خوێنەرانی بەرێزە • تا ئێستا لە دوو رۆژنامە لەسەر کارەکەم دواون وەکو رۆژنامەی ئەلتەئاخێ ، ژمارە (٢١٢٨) رێکەوتی ١٩٧٦/٢/١٠ ،وە رۆژنامەی ئەلعیراق، ژمارە (٢٨) رێکەوتی ١٩٧٦/٣/٢٣ •

زانایانیش وەکو : ك • ك • کوردۆییف ، چ • خ • بەکاییف ، یو • یو ئەڤالیانی ، ك•ر• ئەیوبی•و ی • ئـا • سمیر نۆڤەو زارێ یوسوپۆڤە لە سەر کارەکـــەم بەبـاشی دواونو رای پـوختی خـۆیان لـــە سـەر دەربڕیـوەو پشتگیریان کردووە • وە هەروەها چەند زانایێکی ئامۆژگای رۆژهەڵات ناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەت لەمۆسکۆداو ئامۆژگای میللەتانی ئاسیاو ئەفەریقیای زانکۆی مۆسکۆش •

نووسینی لێکۆڵینەوەو بنیاتی دروســــتکردنی رستەی لێکـ . شوێنکەوتووخواز بە پەیوەندیەوە لەگەڵ هەموو پلەکانی یاسا گراماتیکیەکانی زمانی کوردی لەلایەك و دیراسەتکردنی یاساکانی ناوەوەیی پێکەیشتنی رستە لەلایەکی تر بایەخێك وەیان پەیوەندیێکی راستەو پتـــەو بۆ خۆی وەدەستدەنێو دەکێشێ نەك تەنها لە رووی تیۆریو بەس ، بەڵکو لە رووی کرداریشەوە •

بەم پێیە پرسیارەکانی سینتاکسی رستەی ئاوێتــە ، بەتایبـەتی رســتەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز سرنجێکی زۆر بۆلای خۆی دەکێشێ •

رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەسەر بنچینەی بڵاوبوونەوەی پەیوەستی گراماتیکی سێماتیکی رستەی سادەوە دەرکەوتووە • لە بناغەی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا گشت رستە سادەکان هـــەروەك لەرووی ستروکتوراو بنیاتەوە ، ئاواشی لـە رووی سێماتیکەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە ، بەڵام ، کە بچینە نێو پلەی شوێنکەوتوویی تا ئەندازەیێك رستە سادە شوێن کەوتووەکان سەربەستێتی خۆیان وونده‌کەن •

بەشە بناغەییەکانی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز بەردەوامیو خۆ چەسپاندنێکی رێزمانی تەواویان هەیە ، هەر وەك لەنێوان رستەی سەرەکی شوێنکەوتوو پەیوەندێکی رێزمانیو سێماتیکی بەتین هەیە •

هەموو رستە شوێنکەوتووەکان لەبەر چاووی وەزیفەی سینتاکسیانەوە وەك بەشەکانی رستەی سەرەکین[1] •

رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز تا ئێستا بە تەواوی باس نەکراوەو کاری تێ نەکراوە • ئەمەش لە زۆر لێکۆڵینەوەکاندا دووپاتکراوەتەوە ، لە گەڵ ئەوەش زیندویەتی ئەم مەسەلەیە پیشاندراوە •

بۆ ئەوەی مەسەلەکانی رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز بە تەواوی چارەسەربکرێن پێویستە بیناو ستروکتوری جیاجیا تییەکانی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز بنووسرێن • لێرەدا بە دیار دەکەوێ ، کە نووسینی یان کۆلینەوە لە یەکێك لەو تیانە ـ رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری ـ دەتوانێ بەتایبەتی کاری رستەی ئاوێتە بکات • بەڵام مەسەلەی خەواسی گرێدانی سینتاکس رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەستراوەتەوە بە مەسەلەی ئالوگۆری گشت یاساکانی شوێنکەوتووی لە زمانی کوردیدا • دیارخستنی

1) А. Пешковский А. М. Русский Синтаксис в Начной Освешене, Москва 1956.

پێشکۆفسکی ئا. م. سیناکس رووسی لەبەر رۆشنایی زانستیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦.

В. Шахматов А. А. Синтаксис Ркосского Языка, Ленинград, 1941

شاخماتۆف ئا. ئا. سینتاکس زمانی رووسی ، لینینگراد ، ١٩٤١

В. Граматика Русского Языка Т.11-часть 2. М., 1954.

Г. Белошапкова В. А. Сложное продлотение в современном литературном Русском Языке, М., 1967 (некоторый вопросы теори

پەیوەندی گەیەنەری نێوان رستەکان ، یەکێکە لە بەشـە گرنگـەکانی پرسیارەکانی رستە ، کە لە عاست رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازی بە ئامرازو بێئامراز دەدوێت •

لە رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا شوێنکەوتووی دیارخەری رۆلی دیارخەر دەبینێ ، بۆیە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری وەك دیارخەر خۆی دەگەیەنێتە ناوی وجودی ( هەیی ) رستەی سەرەکیو خاسیەتی واتایی ئەم ناوە وەردەگرێت لە رووی شتو رێچکەو نیشانەو وەزعیەتو عەلاماتی • رستەی شوێنکەوتوو دیارخـەری بـە بەراوردکردنەوەی لەگـەڵ دیارخـەر دەردەکەوێ ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری قەوارەو و تواناى گەلێ فراوانترە لـە دیارخەر ، هەر چـەندە هەردووکیشیان بۆ یەکتر هاوکارو هاوواتان[1] •

لـە سینتاکسی رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەریدا گشت پرسیارە بنچینەکانی سینتاکسی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز کۆدەبنەوە •

ئەم تیپە رستە لێکدراوە شوێنکەوتووخواز بە بەراوردی لەگەڵ تیپەکانی تر بە بڵاوترینو فرە بەکارهاتووترین تیپ دادەنرێت • سەرەڕای ئەمەش ئەو جۆرە تیپە رستەیە دەتوانێ بە هەموو جۆرە رستەکانی ترەوە بلکێت • وە هەروەها دەتوانێ ببێتە رستەی سەرەکی بۆ رستە شوێنکەوتووە کانی تر وە توانای ئەوەشی هەیە ، کە بگەڕێتەوە سەریان[2] •

---

1) A. Гвоздев А. И. Совpеменый Литературный Русский Язык, Москва 1958, часть 11.

گڤۆزدێڤ ئا. ن. زمانی ئەدەبی ئێستای رووسی ، مۆسکۆ ، ۱۹۵۸ ، بەشی دووەم .

Б. Руднев А. Г. Синтаксис современного Русского Языка, Москва, 1968.

رودنێڤ ئا. گ. سینتاکسی ئێمروی زمانی رووسی ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۸ جـ – بڕوانە بەشی یەکەمو لقی سێیەم ، لقی چوارەم بەشی دووەم .

لە بەر ئەوە کۆلینەوە لەو جۆرە تیپە رستە شوێن‌کەوتووە بناغەیێکی واتابەخشی بەکەلکو پتەو وەدەست دەنێ لە پێناوی تێکرای کۆلینەوە لە تیپەکانی تری رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخواز .

باسەکەی ئەم کارەش بە ناوی « رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخواز لە گەڵ شوێن‌کەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا»یە

ئەم کارەی بەردەستیش لە پێشەکیێکو سەرەتایێك سێ بەش‌و ئەنجامێك پێك‌هاتووە . لە بەشی یەکەمدا تەماشای مەسەلەکانی بیناو ستروکتوری رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بە ئامرازو هۆیەکانی گەیەنەری‌و گەیاندنی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەرستەی سەرەکیەوە دەکات‌و هەروەها باسی تیپەکانی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری‌و رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری لەگەڵ رستە شوێن‌کەوتووەکانی تر دەکات . وە جێگای شوێن‌کەوتووە دیارخەریەکان بەرامبەر رستەی سەرەکی لەنێو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا پیشان‌دەدات .

لە بەشی دووەمیشدا بە وردی لە پرسیارەکانی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز دەدوێ ، بە تایبەتی لە بابەتەکانی وەك دروست‌کردنی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازو ئامرازەکانی گەیاندنی شوێن - - کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز بە رستەی سەرەکی . هەر ئاواش لە بارەی تیپەکانی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازیش دەدوێ ، دیسان باسی ئەوەش دەکات ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز دەگەرێتەوە سەر جۆرەها رستە شوێن‌کەوتووەکانی تر . جێگاو جێ‌گۆڕی رستە دیارخەریە بێ ئامرازەکان پیشان‌دەدات بەرامبەر رستەی سەرەکی .

لەبەشی سێیەمیش‌دا لە بارەی رۆلی ووشەی تەناسوبی دەدوێت لە نێو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا لەگەڵ رستەی لێکدراوی

شوێن‌کەوتووی دیارخەری • هەروەها سەبارەت ئەوەش دەدەوێ ، کە لەناو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا ووشەی تەناسوبی بەکار تایەت لە زمانی کوردیدا •

بۆ ئەم کارەش بە وردی سەرچاوەی تایبەتی بە زمانی کوردی ، رووسی ئینگلیزی ، ئەڵمانی ، فەرەنسی ، فارسی‌و عەرەبی ، کە سەبارەت پرسیارو مەسەلەکانی رێزمانی کوردی‌و رووسی‌و فارسی‌و تاجیکی‌و عەرەبی دواون • بەزۆری سەیری ئەم بەشانەیان کراوە ، کە باسی رستەی ئاوێتەو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخواز لە گەڵ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەکەن •

بۆ وەرگرتنی نموونەش ، کە لە کارەکە بەکارهاتوون سەیری زۆر کتێبی ئەدەبی ورۆژنامەو گۆڤارە کوردیێکان کراوە • بە تایبەتی کاری چیرۆك‌و دیوانی شیعر ، وەکو دیوانی نالی ، بێخود ، پیرەمێرد ، دیلان •• هتد • نموونە لە کتێبی ئەدیب‌و نووسەرانی وەك برایم ئەحمەد ، عەلائەدین سوجادی‌و مەسعود محمەدو د• مەعروف خەزنەدارو عیزەددین مستەفا رەسووڵ‌و کاوس قەفتان‌و حسین حوزنی موکریانی‌و حسین‌عارف •••• هتد وەرگیراوە •

# شوێنکەوتووی دیارخەری
# لە ناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

بۆ ئەوەی گشت گیروگرفتەکانی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز چارەسەر بکرێتو وەڵامی هەموو پرسیارەکانی بدرێتەوە ، پێویستە لـە هەموو جۆرە شوێنکەوتووەکان بکۆڵدرێتەوە • هەر وەك لێکۆڵینەوە لـە رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەری دەتوانێ گیروگرفتی جۆراوجۆری سینتاکسی رستەی ئاوێتە چارەسەر بکات • ئاوا دەبینین ، کە ئەو پرسیارانەی، دەربارەی خاسیەتی لکاندنی سینتاکسی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەستراوەتەوە بـــە مەسەلەی پێشکەوتنو ئاڵوگـــۆڕی گشـت یاسـاکانی شوێنکەوتوو • دیـارخستنی پێـوەندی شوێنکەوتوویی نێـوان رستەکان یەکێکە لەو پرسیارە تایبەتیانەی ، کە رستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو ـ خواز بە رێگای راناوەکان یان بە رێگای رستەی لێکدراوی شوێن کـە ـ وتووخوازی بێ‌راناوەوە لێی‌دەکۆڵێتەوەو وەڵامی دەداتەوە •

لـە رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا رسـتەی شوێنکەوتووی دیارخەری وەك دیارخەر شوێنی ناوی رستەی سەرەکی دەکەوێتو خۆی لە

گەڵ واتای زاهیری و مادی ناوەکەدا دەگونجێنێت بە هۆی دەست نیشان کردنی کارەکەی یان حالەکەی یان نیشانەکەی . رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری تواناکەی گەلێ فراوانترەو بەهێزترە ، هەروەها قەوارەکەشی گەلێ گەورەترە لە دیارخەر ، هەرچەندە هەردووکیان هاوچەشنن لە کردەوەدا .

لە سینتاکسی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری گشت پرسیارەکانی سەرەکی سینتاکسی رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز بە گشتی کۆدەبنەوە . ئەو جۆرە رستەیە لە نێو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو ـ خوازدا بە بەراوردکردنی لەگەڵ رستە شوێن کەوتووەکانی تردا بە باوو بڵاوترین و زۆر بەکارهاتووترین جۆر دادەنرێت ، سەرەڕای ئەوەش دەتوانێ خۆی بە زۆربەی رستە شوێن کەوتووەکانی تردا بلکێنێت هەروەها دەتوانێ ببێ بەرستەی سەرەکی بۆ رستە شوێن کەوتووەکانی تر یان بگەڕێتەوە سەریان ، بۆیە شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی دەبێتە بناغەیێك بۆ دیراسەتکردنی گشت جۆرەکانی رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز .

رستە شوێن کەوتووی دیارخەری لەزمانی کوردیدا تا بڵێی کەم باسکراوە ، تەنانەت لەلایەن هەندێ نووسەرانی رێزمانی کوردی و کوردشناساندا چەند کورتە پرسیارێکی وەڵام دراوەتەوە . بەڵام ئەم کورتە باسەش بە شێوەیێکی قووڵ و زانستیانەی تەواو یان بە شێوەیێکی جیاوازو تایبەتی باس نەکراوە .

باس کردنی ئەم جۆرە تیپە لە سینتاکسی کوردیدا لە چوارچێوەی پیشاندان و روون کردنەوەیێکی سەرپێیی و چاوپێداخشاندنێك دەرنەچووە . زۆربەی ئەم باسانەش لە نێو قەوارەی کتێبە گراماتیکیەکاندا دەرنەچووە ، کە دەربارەی چەند بابەتێکی رێزمان دەدوێن .

ئەو رێزمان‌نووس‌و زانایانی زمان ، کە لە سەرەتای ئەم کارەدا هاتوون هەرئەوانەشن لابەلای قسەیان لەسەر رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری کردووە •

رستە شوێن‌کەوتووە دیارخەریەکان لە رووی لکاندیانەوە بە رستەی سەرەکیەوە لەنێو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا دەکرێن بە دوو بەشەوە :

یەکەم ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز •

دووەم ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز •



## لقی ا : بینای رستەی
## شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز

بۆ ئەوەی ، بە وزدی لــە بینای رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەری بەئامراز بکۆڵینەوە ، دەبێ بە درێژی باسی ئەو بەشەی رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز بکـەین ، کــە رستەی شوێنکەوتووی دیارخــەری بەئامرازیان لەسەردەوەستێت • بـە بەراوردکردنی رستەی شوێنکـەوتووی دیارخەری لەگەڵ رستە شوێنکەوتووەکانی تردا بۆمان دەردەکەوێت ، کـە رســتەی شوێنکەوتووی دیارخـەری بینایەکی سینتاکسی هێجگار بـەرزو پێشکەوتووی هەیە •

رستەی شوێنکەوتووی دیارخــەری ئەرکی دیارخەرێکی فــراوان جێبەجێدەکات ، کــە دەگەڕێتــەوە ســەر بەشێکی رســتەی ســەرەکیو پێك هاتووە لە ناوی وجودی ( هەیی ) •

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەتوانێ بگەڕێتەوە سـەر موبتەدا ، هەروەها سەر ئەو ناوانەش ، کــە بـە هۆی ( ی ) ی ئیزافـەتو ئامرازی (و)ی پەیوەست پێکەوە دەنووسێنو دەبنە ناوی دیارخراو و پێیان دەوترێت گرۆپی سینتاکس •

## ١ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بە ئامراز دەگەڕێتەوە سەر موبتەدایی رستەی سەرەکی

ئەو ناوەی ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر پێی‌دەوترێ ناوی دیارخراو • ناوی دیارخراو دەتوانێ ببێ بە موبتەدای رستەی سەرەکی• ئەویش لە عاستی خوێندا ناوی هەیەو راناوەو گرووپی سینتاکسیە•

**ا ـ موبتەدا ناوی هەیە :**

— جوامێر ، کەلە پەنا تاوێرەکە دانیشتبوو ، چاووی بڕیبووە ئاسمان •

— ( نالی ) ، کە غولامی مەدەدی زولف‌و برۆتە

شاهێکە لە بن سێبەری باڵی دوو هۆمادا

( دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٤٤ )

— کەعبەیی ئەشواق وەکو خورشیدو من چاووم زەعیف

لێم بووە رەوشەن ، کە بوعدی قوربەو قوربی بوعدە بۆم

( دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٧٣ )

— چیمەن ، کە سەوزەی نەوخیزی ناوە

بەلقەی فتبۆل پێ‌پەست کراوە

( دیوانی پیرەمێرد ،ل ٢٢٠ )

**ب ـ موبتەدا راناوی جودایە :**

بۆنموونە :

— تۆ ، کە بە مامۆستایەکی باش ناسراوی ، شوێنی خۆت لە ناو میللەتدا بینیوە •

— ئێمە ، کە گەنجین ، ئەوەتا لە وزەمانا نەماوە •

— من ، که له شیعردا ئاگه‌مه ئه‌وان

هاوار ئه‌به‌مه باره‌گای یه‌زدان

( دیوانی پیره‌مێرد ، ل ـ ٢٤٥ )

— مناڵه‌کان

ئه‌ولادی وه‌طه‌ن ، ئێمه ، که‌وا میلله‌تی کوردین

بۆ غایه‌تی ئاسایشی میللەت هه‌موو گوردین

( دیوانی بێخود ، ل ـ ١٣٦ )

ج ـ موبته‌دا راناوی نیشانه‌یه :

بۆنموونه :

— ئه‌وانه‌ی ، که بیوونه وه‌زیر ، له‌وی زیره‌کترو زاناتر نه‌بوون ٠

— تو هه‌ر ئه‌وه‌ی ، که چاوت جه‌رگی بڕیم به‌ئیما

من هـه‌ر ئه‌وه‌م ، کـه عه‌شقت کردومی وێڵی شاران ( دیوانی سالم ، ل ٨٩ )

د ـ موبته‌دا گرووپێکی سینتاکسیه :

موبته‌دا ، که ناوی دیارخراوه ، لێره‌دا له کۆمه‌ڵه ووشه‌یێك پێکهاتووه. ئه‌م کۆمه‌ڵه ووشه‌یه به یارمه‌تی ( ـ ی ، ـ ه )ی ئیزافه‌ت یان ( و )ی په‌یوه‌ست. پێکه‌وه ده‌به‌سترێنه‌وه ٠ بۆ نموونه :

ئازربایجان ، که دوو ملیۆن دانیشتوانی هه‌یه ، هه‌مووی شوێنی کورد. بووه ٠ ( مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی )

— ئه‌و قسه‌و فیکرانه ، که کورده ده‌شته‌کیه‌که کردوونی ، خاڵی نه‌بوون. له فه‌لسه‌فه ٠

( مێژووی ئه‌ده‌بی کوردی )

— ئەو کێو دەشتانەی، کە کەوتوونەتە شیمالی ڕێگەی (ڕەها ـ موسڵ)ەوە، لە بەرە بەیانی تاریخەوە شوێنی ئادەمیزاد بوون . ( مێژووی ئەدەبی کوردی ـ ل ٤٢ )

— داری ئەراکو دارهیند هەردوو ، کە عوودە ئیسمیان
هەمدەمی سووتنە ، ئەم ئەو مەیلی ئەبێ لەهەب دەکا

( دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٥٣ )

**هـ ـ موبتەدا ناوەڵناوی ناویە :**

١بو نمــــوونە :

— ئـەوەش تەوەزەل‌وگێل‌و گەوجەکان ، کە مایەی گاڵتــەو قەشــمەری هەمووان بوون ، بزانە چ لــە مەیدانی کاسبی‌و کاری ئازادا چ لــە مەیدانی فەرمانبەری‌دا چ شوێن‌و پایەیێکی دیاریان هەیە : ( ژ . گ ، ل ـ ٤٧ ) .

— چاووشین ، کە لە نێو هەموویاندا دیارو باڵا بەرزتر بوو ، دەستی بـە نوکتەبازی کردو ئەوانیش کەوتنە پێکەنینێکی بە جۆش .

— پەرۆش ، کە هەردەم پەرۆش بوو بۆ ژیان ، لەکۆڕەکەدا دیار نەبوو .

**٢ ـ ڕستەی شــوێن کەوتووی دیارخەری بەنامراز دەگەڕێتەوە ســـــەر بەرکاری یەکســـــەر لــە ڕستەی سەرەکیدا**

ناوی دیارخراو ، کە ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر دەتوانێ ببێتە بەرکاری یەکسەر لە ڕســتەی سەرەکیدا . ئەم بەرکارە یەکسەرەش لە عاستی خۆیدا ناوە یان ڕاناوە یان گرووپێکی سینتاکسی‌یە .

ا ـ بەرکاری یەکسەر ناوە :

بۆ نموونە :

— ئەمیر عەلی شاە ، کە چلۆنی دەولەتی لە موسلێدا رێکخست ، ئەردەشێری کوڕی هورمز ، کە یەکێك بوو لە ئومەڕایانی لەشکری ، بە تایبەتی لەسەر مووسلێیدا دانا •

— مامۆستا رزگاری دانا ، کە زیرەکترین قوتابی پۆلەکە بوو ، چیرۆکەکە بنووسێتەوە •

— کابرا ئەو کوڕەی تێ گەیاند ، بەکارەکە هەلسێ ، کـــە لە هەموویان گەورەتر بوو •

ب ـ بەرکاری یەکسەر راناوی جودایە :

بۆ نموونە :

— من تۆم راسپارد ، بە پاسەوانی کردنی مەڕەکان ، کە ناوبانگی پاکیو دلسۆزیو ئازایەتیت دەرکردووە •

— ئێمە ئەومان تەرخانکرد بچێتە پێخاڵ بۆ دەستنیشانکردنی جێگای سەیران ، کە لە هەموومان شارەزاتربوو و گەلێ جاریش چوو بوو بۆ ئەوێ •

ج ـ بەرکاری یەکسەر گرووپێکی سینتاکسییە :

ناوی دیارخراو ، کە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامـــرازی دەگەڕێتەوە سەر ، دەتوانێ لە کۆمەلە ناوێکەوە پێك بێت ، ئەو کۆمەلە ناوە بەیارمەتی ئیزافەت پێکەوە دەبەسترێنەوە • بۆ نموونە :

— بەڕێوەبەری پۆلیس، گوێی نەدایە توندی قسەکانی تڕوی، کە ئەیویست تەمابڕی بکات • ( جەنگاوەرێکی ڤێتنامی ـ ل ٤١ ) •

— باوکی چەند کراسێکی رەنگین و جوانی بۆ هێنابوو ، کە لە شارەکەیاندا دەست نەئەکەوتن •

— دەستەیێك قەڵەمی جوانی دەستکەوتن ، تازە بە تازە دەرکەوتبوون •

— حوسێن عارف کۆمەڵە چیرۆکێکی کوردی خستبەبەر خامەی لێکۆڵینەوە ، کە لەم دوایەدا لە رۆژنامەکان یان بە نامیلکە بڵاوکرابوونەوە •

— ( نالی ) یا ! ئەم غەزەلە تازە ، کە تازەت گوتووە
بە دوو سەد مەسنەوی و لوبی لوبابی نادەم

( دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی ، ل ٧٣ )

د ـ بەرکاری یەکسەر ئاوەڵناوە :

هەندێ جار ناوی دیارخراو ، کە بەرکاری رستەی سەرەکیە ئاوەڵناوە، جا بەتەنها دەردەکەوێت یان کۆتایی بە ئامرازێك لە ئامرازەکان هاتووە • بۆ نموونە :

— خوایە ئەم دڵەم هێزێکی بەرێ
کە غەم لە ناو خۆی بکاتە دەرێ

( دیوانی پیرەمێرد ، ل ـ ٣٧٨ )

لەم رستەیەدا ووشەی « هێزێك » بەرکاری یەکسەرە لە رستەی « خوایە ئەم دڵەم هێزێکی بەرێ » ، کە رستەی سەرەکیە لە ناو رستەلێکدراوە شوێنکەوتووخوازەکە • لە هەمان شوێندا ناوی دیارخراوە ، کە رستەی شوێنکەوتی دیارخەری « کە غەم لە ناو خۆی بکاتە دەرێ » دەگەڕێتەوە سەر •

### ٣ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر بەرکاری نایەکسەر لە رستەی سەرەکیدا

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەو ناوەی ، کە بەرکاری نایەکسەرە لە رستەی سەرەکیدا • لێرەدا بەرکاری نایەکسەر ، کە ناوی دیارخراوە دەتوانێ ناوێك یان گروپێکی سینتاکسی بێت •

ا ـ بەرکاری نایەکسەر ناوە :

بۆ نموونە :

ــ بۆ ئەو کەسەی ، کە بیەوێ لە بنج و بنەوانی زمانی کوردی بکۆڵێتەوە، پێویستە شارەزاییەکی تەواوی لەسەر پەیدا کات •

ــ بابە تاهیری هەمەدانی بەو زمانە شیعری داناوە ، کە کورد قسەی پێدەکات •

ــ کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت
لەو تەختە ، کەوا ساحیبی مۆرن بەسەردارەت

( دیوانی نالی و فەرهەنگی نال ، ل ٥٩ )

ب ـ بەرکاری نایەکسەر گروپێکی سینتاکسیە :

بۆ نموونە :

ــ بەڵام پتر هەستی بە چاووی دراوسێیەکان ئەکرد ، کە لە ئاگر بەقینترپیایدا ئەچزان •

ــ لە سندووقی پڕی سینەم بترسە
کە ئاگر بەربداتە تەخت و تابووت

— جار جاره چاووێکی له دایکه خۆشەویستەکەی هەڵئەبڕی ، کـه لـه پێش ئاگردانەکە بەرامبەریان دانیشتبوون • ( ۱۰ چیرۆك ، ل ۱۲۹ )

— بۆ بترسم لە شەبەیخوونی عەدوگاهی کەمین
کە هەناسەی سەحەری خەنجەری بورڕانی منە
(دیوانی سالم ، ل ۳۰)

### ٤ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیـارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر ئاوەڵکار لە رستەی سەرەکیدا

رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەو ناوەی ، کە لە رستەی سەرەکیدا ئاوەڵکارە • لێرەدا ئاوەڵکاریش دەتوانێ ئاوەڵکاری شوێن ، کات، بەراوردی و ئامرازبێ•بە پێی ئەمە ناوی دیارخراو لە رستەی سەرەکیدا ئاوڵکاری کاتە ، شوێنە لەیەك‌چوواندنە ••• هتد •

**ا ـ ناوی دیارخراو ئاوەڵکاری شوێنە :** -

بۆ نموونە :

— وەخت بـــە وەختیش دانەوێلـــەو زەکـاتو ســـەرفترەی گوند رێی خۆش‌ئەگرت بۆ عەمبارەکەی مزگەوت ، کە مەلا پاسەوانو ئەمینداری بوو • (چیرۆکەکانی مەم ، ل ـ ٤٠ )

— سەرێك لە کارگەی باڵنویت بدە ، کە لۆکەی تیمارکردنی تیائەپێچنەوە، بۆت دیاری ئەدا ئەڵێم چی • ( جەنگاوەرێکی ڤێتنامی ، ل ـ ۱۱ )

— هەر لە بازاڕەکەدا شتی دەکڕی ، کە تازە دروست‌کرابوو و شتی چاکی بۆ دەهات •

— چووم بۆ چێشتخانەکەی ئەوسەر ، کـە جاران نانمان پێکـەوە تێـدا دەخوارد •

**ب ـ ناوی دیارخراو ئاوەلکاری کاتییە :**

بۆ نموونە :

بەخۆیی‌و کورەکەی هەر ئەو رۆژە مردن ، کە تۆی تیا بریندار کرایت ۰
(ژ ۰ گ ۰ ، ل ـ ٢٤٨)

ـــ قسە خۆشەکانی ئەو کاتانەی نەمابوو ، کە لەگەڵ هاورێکانیدا ئەیکردن۰

ـــ هەر یادی ئەو سالآنەی دەکردەوە ، کە لە کۆلێجدا لەگەڵ برادەرەکانی کاتی دەبردە سەر ۰

**ج ـ ناوی دیارخراو ئاوەلکاری لەیەك چوواندنە :**

بۆ نموونە :

ـــ باوکە گیان ۰۰۰ ، کە هاتیتەوە ، ئەبێ لەگەڵ خۆت دەستە جلێکی زۆر جوانم بۆ بهێنی وەکو جلەکانی شێرکۆ ، کە باوکی لە هەولێر بۆی هێنابوو ۰ (چ۰ مەم ، ل ـ ١٥٢)

ـــ من پێم ناکرێ وەك ئەو دوو رووانە بژیم ، کە ئازاری هاولآتیان دەدەن ، هەر بۆ ئەوەی ، کە خۆیان بە خۆشی بژین ، (ج ڤێتنامی ، ل ـ ١١٠)

**م ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر بەشی ناوی خەبەری لە رستەی سەرەکیدا**

لێرەدا رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر بەشی ناو لە خەبەری رستەی سەرەکیدا ۰ لێرەدا وا دەگەیەنێ ، کە خەبەری رستەی سەرەکی پێکهاتووە لە دوو بەش ؛ بەشی ناوو بەشی فرمان ۰ جا رستەکە دەگەڕێتەوە سەر بەشی ناوەکەی خەبەری رستەی سەرەکی ۰
بۆ نموونە :

— لولوبی یان لولو ، که به باپیره گەورەی لوڕ دائەنرێن ، ئەمانە قەومێك بوون ، که له زەهاوو شارەزوور ــ سلێمانی ــ دائەنیشتن • ( م• ئه • کوردی ، ل ـ ٣٧ )

— ئەوە ئەو شەقامەیە ، کە لاوە بۆی نووسیبوو • ( ژانی گەل )

— سیسۆ کوڕێك بوو،که ناوبانگێکی باشی له راوو راوشکاری هەڵدابوو•

— محەمەد پاشای کۆرە گەورەیێك بوو، که حوکمداریەتێکی دادپەروەری کوردەواری له رواندزێدا دامەزراندبوو •

### ٦ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر دیارخەر له رستەی سەرەکیدا

دیارخەر ووشەیێکە ، کـە وەسـفی ناوێك دەکات بـە مەبەستی پتر وەدیارخستنی ناوەکە ، ئەم ووشەیەش له ناو رستەی سەرەکیدایە ، که رستە شوێنکەوتووەکانی دەگەڕێتەوە سەر • جا لێرەدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر ئەم وشە دیارخەرەی ناو رستەی سەرەکی • دیارخەریش وەنەبێ هەر ناو بێ‌و بەس ، بەڵکو دەبێ راناویش بێ یان ووشەیێکی تر • وەك :

م ـ دیارخەر ناوە :

بۆ نموونە :

— ڤاوشی ژنان بەرامبەر شوێنی مێزە بچکۆلەکەی پاسەوانەکەیە ، کـە چاوودێری ئەو ئوتومبێلانە ئەکا ، که دێن‌و دەچن • (ج ، ڤێتنامی ، ل٨)

— لەگەڵ تاقمە کرێکارێکا چوو بۆ خاكسپاردنی شوفێرێك ، کـە ئەمەریکایەکان کوشتبوویان • ( جەنگاوەرێکی ڤێتنامی ، ل ـ ٥٧ )

## لقی ٣ : رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر رستە شوێنکەوتووەکانی تر لەناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەتوانێ لەگەڵ رستە شوێنکەوتووەکانی تریشدا بێت ، وەك شوێنکەوتووەکانی بەرکاری ، ئاوەڵکاریی و هیتر ... هتد . ئەمەش وەك لەم نەخشەی خوارەوەدا دیارە :

نەخشەی یەکەم

رستەی سەرەکی ،

رستەی شوێنکەوتووی یەکەم ،

رستەی شوێنکەوتووی دووەم .

نەخشەی دووەم

رستەی سەرەکی ،

رستەی شوێنکەوتووی
بەرکاری ، وەیان هەر
شوێنکەوتووێکی تر

رستەی شوێنکەوتووی
دیارخەری بەئامراز

## ١ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری

بۆ نموونە :

ـ ئەبێ ئەوەش
بزانین ،

کە ووشەی مەلا عەرەبی
نیەو ئەو مەعنایانەی ،

کە لە عەرەبیدا بۆی
لێئەدەنەوە ،
هەمووی هەڵەیە .
( م . گە . کوردی ، ل ١٠٠ )

لە رستەی سەرەوەدا ( ووشەی مەلا عەرەبی نیەو ئەو مەعنایانە هەمووی هەڵەیە ) رستەیێکی بەرکاری‌یەو وەڵام لەسەر پرسیاری ( چی ؟ ) دەداتەوە . رستەی ( لە عەرەبیدا بۆی لێئەدەنەوە ) شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامرازە . ووشەی ( مەعنایان ) دیاردەخات ، کە لە ناو رستەی بەرکاریدایەو بۆتە بەشێکیش لە بەشەکانی . ئەم حاڵەتە لە نموونەکانی خوارەوەشدا دیارە . بۆ نموونە :

شێرکۆ بە دڵێری ووت ،

که ئەمساڵ هەرئەبێ بچینە هاوینە هەوارەکانی کوردستان ،بەڵام
نەك ئەو هاوینە هەوارانەی

که پارەکە چووینێ •

مامۆستا روونیکردەوە ،

کەگشت خوێندکارەکانی پۆلیچوارەم سەرکەوتنو دەرچوون
تەنها ئەو دوو سێ خوێندکارە نەبێ ،

که زۆرکەم له پۆلو دەرسدا
دەردەکەوتن •

۲ – رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز
دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێنکەوتووی ئامانجی •

بۆ نموونە :

رەخنەکانی ، که ترۆی لێیئەگرتی ، بەو نیازە بوو ، ( که پێتبکەیێنێو
بتگەیەنێتە رادەیێك •

که خۆت راستو چەوت لەیەك بکەیتەوە • (ج • ف
، ل – ٥٨ )

لەم رستەیەدا شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز خۆت راستو چەوت
لەیەك بکەیتەوە ) دەگەڕێتەوە سەر ووشەی « رادەیێك » ، که بەشێکه له
بەشەکانی شوێنکەوتووی ئامانجی ( پێتبکەیێنێو بتگەیێنێتە رادەیێك ) •
بەمەوە لەم رستە لێکدراوە شوێنکەوتووخوازەدا شوێنکەوتووی دیارخەری
بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر شوێنکەوتووی ئامانجی • سەیری نموونـەکانی
خوارەوەش بکەن :

شیعره‌کانی شاعیری کورد حاجی قادری کۆیی بەو مەبەستە شورشگێڕ بوون کە میللەت هانبدات بۆ خۆرزگارکردن بەتایبەتی ئەو لاوانەی گەل ، کە خوێندەواربوون مەشخەڵی خوێندیان هەڵگرتبوو •

میری شۆڕش یاسای نەخوێندەواری بڵاوکردەوە بە ئامانجێ ،

کە نەخوێندەواری لە وولاتدا نەهێلێ بەتایبەتی لـەناو ئـەو تیرەی میللەت ،

کە دەمێکە لەناو تاریکایی نەخوێندەواریدا دەژین •

۴ – رسـتەی شـوێن‌کەوتووی دیـارخەری بەئامراز دەگەرێتەوە سەر رسـتەی شوێن‌کەوتووی هۆیی

بۆ نموونە :

ئەگەر بکەونە سەر ئەم باوەڕە ، لەو تەنگەو چەلەمەیە رزگاریان ئەبێ، کە بڵێین تاریخێکی توزێ نزیك لە بارەی چوونە کورد بۆ کوردستان دوای ( ٦٥٠ )ی پێش میلاد بووە ،

چونکە بەڵگەکانی ئاشوری ،

کە تاریخیان بۆ پێش ئەم تاریخە ئەگەڕێتەوە ،

لەم بابەتەوە هیچ قسەیێك ناکەن •

لەم رستەیەشدا شوێن‌کەوتووی ( بەڵگەکانی ئاشوری لەم بابەتەوە هیچ قسەیێك ناکەن ) وەڵام لەسەر پرسیاری ( بۆ چ ؟ ) دەداتەوە • لەبەر ئەوە رستەیێکی ( هۆیی )یەو شتەکە یان رووداوەکە دیاردەخات بۆ سەر ئەم رستەیەش شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز ( تاریخیان بۆ پێش ئەم تاریخە ئەگەڕێتـەوە ) دەگەڕێتەوە ، بـە هۆی کۆمەڵە ووشـەکانی ( بەڵگـەکانی ئاشوری )،کە ناوی دیارخراوە وکەوتۆتە ناو رستەی شوێن کەوتووی هۆیی•

خانزادی لەشکری دەمێکە لە مێژووی کورددا ناوبانگی دەرکردووە ،
چونکە زۆر دلێرانە ئەو سنورەی دەپاراست ،
کە کەوتبووە ژێر دەسەلآتی •
هەرچەند بە بەردەمیا رەتدەبوو نە سلآوێك نە بەیانی باشێکی پێش کەش ئەکرد ،
لەبەر ئەوە ئەو رۆژانەی ،
کە لە گەلی رابواردبوون ،
لا خۆش نەبوون •

**٤ - رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەناوەڕاو دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن‌کەوتووی مەرجی**

بۆ نموونە :.
ئەگەر ئەو کەسانە ،
کە پسپۆرن لە نەژادشناسیدا ،
بێن و بە تەواوی لە خوێن و ئەندام و جمگەو چاوو و مووی ئەمانە کە ئەوان پێیان ئەڵێن گۆرانن و بە غەیری کوردیان دەرئەکەن ،
وردبینەوە سەیریان بکەن ـ وەکو کردوویانە ـ لە ڕووی یاسایێکی عیلمیەوە ئەو هاوارە ئەکەن ،
کە ئەمانە کوردن • ( م • ئە • کەردی )

لەم رستە گەورەیەدا دوو رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری هەن (پسپۆرن لە نەژادشناسیدا ، ئەوان پێیان ئەڵێن گۆرانن و بە غەیری کوردیان

دەرئەکەن ) دەگەڕێنەوە سەر شوێن‌کەوتووەکانی ( ئەو کەسانە پێن‌و بەتەواوی لە خوێن‌و ئەندامەو جمگەو چاوو و مووی ئەمانە ورد بینەوەو سەیریان بکەن ـ وەکو کردوویانە ـ لە رووی یاسایێکی علیمیەوە ئەو هاوارە ئەکەن ) شوێن‌کەوتووی مەرجی‌یە ، کە هەردوو شوێن‌کەوتە دیارخەریەکانی دەگەڕێتەوە سەر . ئەم رستە شوێن‌کەوتووە مەرجی‌یە لە عاستی خۆی‌دا دەوری رستەی سەرەکی دەبینێ بۆ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری . لە گاخاوتن‌و نووسینی ئەدەبیدا جۆرەها لەم چەشنە رستەیە هەن . بۆ نموونە شاسوار هەڵیدایەوەو ووتی ،

منیش لەگەڵتان دێم بۆ سەیران ،
ئەگەر ئێوە بچنە ئەو شوێنەی
کە چەند ساڵ لەمەوبەر چووبوونیێ

لەناو کورددا شاعیری چاك هەڵکەوتوون ، بەڵام ئێستا وون ،
ئەگەر لە کۆنەوە مێژووی ئەدەبی ئەو شاعرانە بنوسرابایەوە،
کە ئێمە هەر بەبیستنی هەبوونیان دەزانین ،
بە وون‌بوویی نەدەمانەوە ،

٥ ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەناوەڵ دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن‌کەوتووی ناچاوەیی

بۆ نموونە :

هەندێ جاری وا توش ئەبێ ، کە کابرایەکی لە ئاشە کۆنێکا بووە ، لە سەرچاووەیەك بووە لەبن دەوارێکا بووە ،

کەچی فکری وای دەربڕیوە کەمترنیە لە فکری ئەو کەسە ،
کە لە دەوری راپەڕینی ئەوروپادا لە سۆربۆن‌و ئۆکسفۆرد فکری وەرگرتووە .
( م . ئە . کوردی ، ل ـ ١٩٨ )

لەم رستەیەدا ، لـەم رستە لێکدراوە شوێنکەوتووخوازەدا رسـتەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر شوێنکەوتووی ( فکری وای دەربڕیوە کەمتر نیە لە فکری ئەو کەسە ) ، کە رستەیێکی شوێنکە ـ وتووی ناچارەییە .

تابلۆی لاوێ کوڕێکی تەمەڵو دڵڕەقە ،

کەچی لای خەڵك هەر خۆشەویستە بەتاییەتی لای ئەوانەی ـ

کە یەکسەر ئاشنایەتیان لەگەڵدا هەیە .

لەناو دانیشتووەکاندا زۆرەك دەسـتی بە قسەکردو وتی ، وڵاتانی ئەوروپا پێشکەوتووترو خۆشترن لە وڵاتی ئێمە ،

لەگەڵ ئەوەش من وڵاتی خۆمم پێ لە هەموویان

خۆشترە بەتاییەتی ئەو ناوچەیەی ،

کەلێی لەدایكبووم و مایەی شادمانیمە تامردن .

## لقی ٤ : تیپەکانی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز لە ناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکان لەناو لێکدراوە شوێنکەوتووخوازێکدا دەتوانن بە شوێن کەوتووە دیارخەریەکانی ترەوەو بلکێن • لەناو رستە لێکدراوە شوێنکەتووخوازێکدا دەبێت چەند رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز بێن ، کە هەموویان دەگەرێنەوە سەر یەك رستەی سەرەکیو بە جۆرەها رێگا بەیەکەوە دەبەسترێنەوە • دەتوانین سێ جۆرە حالەتی بەیەکەوە بەستنەوەی سینتاکسی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بە رستەی سەرەکیەوە دەستنیشان بکەین :

١ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەرێتەوە سەر یەکێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی •

٢ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەرێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی •

٣ ـ یەکێك لە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکان دەگەرێتەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکیو رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکەی دووەم دەگەرێتەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری یەکەم • وەهەروەها ••• هتد[1] •

---

(١) بەم جۆرە دەووترێت « رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری یەك بە دوای یەك هاتوو » .

## ١ - رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەڕێتەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی

ئەمانە ئەو جۆرە رستانەن لە لێکدراوە شوێنکەوتووخوازەکاندا ، کە یەك ، دوو یان چەند رستەیێکی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگرنە ناو قەوارەی خۆی ، کە هەموویان دەگەڕێنە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی • شوێنکەوتووی دیارخەری ئەم تیپە هەمویان بەیارمەتی ئامرازی پەیوەست بەیەکەوە دەبەسترێنەوە • ئەم جۆرە تیپەی شوێنکەوتووی دیارخەری پێی‌دەوترێت شوێن یەك کەوتوو • هەر وەك لەم نەخشانەی خوارەودا دیارن •

### نەخشەی یەکەم

رستەی سەرەکی ،

رستەی شوێنکەوتووی یەکەم

ئامرازی پەیوەست

رستەی شوێنکەوتووی دووەم

ئامرازی پەیوەست

رستەی شوێنکەوتووی سێیەم

•••• ••• ••• هتد •

### نەخشەی دووەم

رستەی سەرەکی ، رستەی شوێنکەوتووی یەکەم

و

رستەی شوێنکەوتووی دووەم

و ، یان ، « ، » ••• هتد

رستەی شوێنکەوتووی سێیەم

••• ••• ••• هتد •

## نەخشەی سێیەم

رستەی سەرەکی ،

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی یەکەم

و ، یان ، « و » ، هەروەها ... هتد

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی دووەم

و ، یان ... هتد

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بە ئامرازی سێیەم

... ... هتد .

## نەخشەی چوارەم

رستەی

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی یەکەم

و ، یان ، بەڵکو ... هتد

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی دووەم

و ، وە ، « و » .. هتد

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی سێیەم

سەرەکی

رستە شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی شوێنیەککەوتوو دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی یان دەرەوەی رستەی سەرەکی . بۆ نموونە :
سەرەڕای ئەمانەش ، ئەو کەسانە ،

که لە کورددا پەیدابوون

و

پاشماوەکەیان بۆ ئێمە بووە بە ئەدەب

ئەیگێڕن بە دەستەوە
دوو جۆر بوون •
(م • ئە • کوردی ، ل ١٤٤)

خـەلقی ،
کە هەموو کوودەکن
و
بەستەزمانن ،

بابێن‌و لە (نالی) ببیەن شیعری سەلیقی
(د • نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ١٢١)

لەم هەردوو رستانەی سەرەوەدا دیارە ، کە لە رستەی یەکەمدا سێ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخـــەری بەئامراز هـەن ، لـــە هی دووەمـدا شوێن‌کەوتووی دیارخـەری هەیە • لـــە هەردووکیانیشدا شوێن‌کەوتووە دیارخەریەکان دەگەڕێنەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سـەرەکی و هەردووکیان ناوەوەین • سەرەڕای ئەوەش ئەم جۆرە رستە شوێن‌کەوتوو دیارخەریانە دەتوانن بین بە دەرەوەیی • بۆ نموونە :

بەڵام تازە چارم ناچار بوو ، دیوانی وەلی دێوانەو بێسارانی چاپ‌نەکرابوو، تاکو بەراوردیان بکەم لەگەڵ ئەو هەڵبەستانەی ،
کە گومان لێیان هەبوون هی پیرەمێرد خۆیەتی
و
بە ناوی ئەوانەوە بلاوی کردبوونەوە •

لەم رستە گەورەیەدا رستە شوێن‌کەوتووەکانی کەوتوونەتە دەرەوەی رستەی سەرەکی •

ئامرازی گەیەنەر « کە » عادەتەن لە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە شوێنیەکەوتووەکاندا دووبارە ناکرێتەوە ، سەرەڕای ئەوەش جاری وا هەیە ، کە تێدا دووبارە دەکرێتەوە . بۆ نموونە :

ئاهووی حەرەمی قیبلەی ئەبرۆن

کە بە دیدە ئەم شەهد لەبانە

کە

هەموو شاهدی چینن

( د . نالی و فەرهەنگی نالی ـ ٨٢ )

لەگەڵ ئەم وسعەتی ئەرضە تەماشای کەنزی ثابت کەن

کە بەردی پڕ لە ئەلماسە

کە

خاکی مایەی گەوهەرە

( د . صاحبقران ، ل ـ ٤٦ )

لە هەردوو رستەکانی سەرەوەدا لە برێتی پێکەوە نووسانی رستە شوێنکەوتووەکان بەیارمەتی ئامرازی ( و )ی پەیوەست دەبینین ئامرازی گەیەنەر « کە » دووبارە بۆتەوە . ئەمەش وا دەگەیەنێ ، کە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بەئامرازەکان دەتوانن لە ناو خۆیاندا بەیارمەتی ئەمرازی « ی »ی پەیوەست بەیەکەوە بلکێن . بۆ نموونە :

« هەموو رێگایەك ئەچێتەوە سەربانە » ئەمە تەواو لە پەندێك ئەچێت ،

کە لە زۆر زمانانی ئەورووپادا هەیە

و

شاعرێکی عەرەبیش کردوویە بە نیوە هۆنراوەیەك

کە ئەڵێ « کل الطرق الیك یا روما تعود »

رسته شوێن‌کەوتووە دیارخەریەکانی بە ئامرازی شوێن کەوتوو ئەبن بە دوو جۆر :

أ ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامرازی شوێن‌یەك‌کەوتووی گونجاو .

ب ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامرازی شوێن‌یەك‌کەوتووی نەگونجاو .

## ١ ـ شوێن یەك‌کەوتووی گونجاو :

لە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامرازی شوێن‌یەك‌کەوتووی گونجاودا راناوی ناوی دیارخراو ، کە جێگای ناوی دیارخراو دەگرنەوە لەناو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا دەبێ یەك وەزیفە ببینن ، هەردووکیان دەبێ موبتەدا ، بەرکاری یەکسەر یان نایەکسەر بێ .. هتد .

راناوی ناوی دیارخراو ، کە وەزیفەی بەرکاری یەکسەر دەبینێ عادەتەن بەکار نایەت،ئاوا راناوی ناوی دیارخراو دەتوانێ ببێ بە بەرکاری نایەکسەر یان ئەوەڵکار . گەر هاتوو ناوی دیارخراو لەناورستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەریدا موبتەدا بوو یان فاعیلی شاراوە ئەوسا ناتوانرێ هیچ سنورێك دیار بخرێ یان دەست‌نیشان بکرێ لە نێوان شوێن‌کەوتووی یەك بە دوای یەك هاتوو شوێن‌کەوتووی گونجاودا ، بۆ نموونە :

شاسوار ،

که گەڕۆکێکی دونیا دیدەیە

و

زۆر جار سەری لە ناوچەی هەولێر داوە ،

ئەڵێ ، شاخ‌و کێوەکانی ناوچەکە زۆر جوانن .

پیرەمێرد ... ... ئەیەویست هەستی کرێکارێك یاخود شاگردێك بیزوێنێ ، ئەو کرێکارو شاگردانە ،

که شەوو ڕۆژ شانو قۆڵیان ئەکوتا

و

ماندوو ئەبوون . («پیرەمێرد» ل ٦)

ئەم جۆرە بینایە وەك ڕستەیێکی شوێنکەوتووی دیارخەری دیارە ، کە چەند خەبەرێکی هەیەو دەگەڕێتەوە سەر موبتەدایێك یان فاعیلێکی شاراوە .

لە گۆڤەرە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی گونجاو ، کە ڕاناوە ناوە دیارخەریەکانی بەرکاری نایەکسەرن لە قسەکردنداو وەهەروەها لە نووسینی ئەدەبیدا کەم بەرچاوو دەکەون . بۆ نموونە :

ئەم گردبووتەوەیە لە دەوری فەرهاد سەنگی مەحەکێکە ،

کەوا ناومڕۆکو جەوهەری فەرهادی پێ تاقی ئەکرێتەوە ، نەك تەنها دیوی دەرەوەو ئازایەتی لە قولنگ وەشاندندا ،

بەڵکو

راو تەگبیرو ژیرو بیرێشی پێ هەڵئەسەنگێنرێت لە مەیدانی دلسۆزی خۆشەویستی دولبەرەکەیدا . ( گ . بەیان ، ژ ــ ١٢ س ــ ١٩٧٥ )

لە هەردوو شوێنکەوتووە دیارخەریە بەئامرازەکانی شوێن‌یەك کەوتوودا ڕاناوی ناوی دیارخراو ــ لکاو «ی ، ی » بەرکاری نایەکسەرن بەیارمەتی « پێ » . ئاواش شوێنکەوتووی دیارخەری گونجاو بێ‌ڕاناوی دیارخراو لە وەزیفەی بەرکاری نایەکسەردا کەم بەکاردەهێنرێن .

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری گونجاو ، کە ڕاناوە ناوە دیارخراوە لکاوەکانی لە وەزیفەی ئاوەڵکاردان ـ تیپێکی زۆر کـــەم بەکارهاتوون ٠ بۆ نموونە :

لە فۆلکلۆری کوردیدا گەلێك پڕیەم‌و ئیپوپیا هەیە ،

کە شەقڵە گشتی‌یەکانی داستانی جیهانی‌و داستانی فولکلۆریان تیا بەدی‌ئەکرێ

و

شەقڵی تایبەتی فولکلۆرو بەرهەمی ناو کوردەوا.یشیان تیا دیارە٠

(ئەدەبی فولکلۆر ، ل ـ ٣٣)

لـــەم نموونەیەدا راناوی ناوی دیارخراو « تیـا » لە هەردوو رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە گونجاوەکاندا ئاوەڵکارە ٠

باڵە هەر لەم شوێنانەی ،

کە لاوەکانی کوردو عەرەب کۆنگرەیان لێ ئەگرتن

و

ئیمپریالیستەکانیش تێکۆشەرانیـان لـێ شـەهید ئەکردن ،

پەیکەری قارەمانیەتی دروستبکرێن ٠

ب ـ شوێن یەك کەوتووی نەگونجاو :

لە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە شوێن یەك کەوتووە نەگونجاوەکاندا راناوی ناوی دیارخراو ، کە دەگەڕێتەوە سەر راناوی دیارخراوی رستەی سەرەکی لە هەریەکەیاندا وەزیفەی لە یەك جودا دەبینن یانی جۆرەها بەشەکانی ڕستە ، بۆ نموونە :

پیرەمێرد هیچی کەم نیە لەو شاعرە بەرزانەی وولاتی بێگانە ،
که بە سەدان پەیکەریان بۆ تاشراوە

و

لە هەموو ڕێکەوتێکا یادیان ئەکەنەوە ، وەکو تۆلستۆی و
ڤکتۆر هۆگۆ و طاغور • ( دە پیرەمێرد ، ل ٥ )
لە هەموو ڕێکەوتێکا یادیان ئەکەنەوە ، وەکو تۆلستۆی و
بەرکاری نایەکسەرە ، وە لە ڕستەی دووەمدا بەرکاری یەکسەرە •
ڤکتۆر هۆگۆو طاغور • ( دە پیرەمێرد ، ل ٥ )
که نەوەی نوێ ڕەفزی ئەکات

و

سەردەمیان بەسەرچووە • (بەیان ، ژ ـ ٢١ ، س ـ
١٩٧٥ )
ڕاناوی ناوی دیارخراوی ڕستەی یەکەم بەرکاری یەکسەرە ، وە هی
دووەم دیارخەرە بۆ تەمەلوك •

ڕاناوی ناوی دیارخراوی لکاو ئەتوانێ لە ڕستە شوێنکەوتووە دیارخەریە
شوێنیەك کەوتووەکانی نەگونجاودا بەدیار نەکەوێ • بۆ نموونە :

خوێندکارە سەرگەرمو کەللە ڕەقەکە ،
که تەمەڵی لە پەڵو پووی خستووە

و

زۆر جاریش لە دەرس کەوتووە
دەم نادەم دەمار ئەیگرتو قوتابخانەی
جێئەهێشت •

ئەتوانرێ راناوی دیارخراو نەك لە هەردوو رستەکەدا ، بەڵکو لە یەکێك لەرستە شوێنکەوتووە دیارخەریە نەگونجاوەکاندا بەکار بهێنرێت ۰ بۆ نموونە :

بەڵام تازە چارم ناچار بوو ، دیوانی وەلی دێوانەو بێسارانی چاپ نەکرابوو ، تا بەراوردیان بکەم لەگەڵ ئەو هەڵبەستانەی ،

که گومان لێیان هەبوو هی پیرەمێرد خویەتی

و

بە ناوی ئەوانەوە بڵاوی کردبوونەوە ۰

(د ۰ پیرەمێرد ، ل ـ ۹۷)

لەرستەی شوێنکەوتووی نەگونجاوی دووەمدا بەرکاری یەکسەر کەوتووە وەناوی دیارخراو تیادا وەك بەرکاری یەکسەر هەستی پێدەکرێ و خۆی شاردۆتەوە لە ناو کۆتایی خەبەری رستەکەدا ۰

**۲ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز دەگەرێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی :**

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز دەتوانێ بگەرێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی ۰ لەم حاڵەتەدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری یەکەم دەکەوێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی ، بەڵام ئەوەکەی تر دەکەوێتە دەرەوەی ۰

بۆ نموونەش ئەم نەخشانەی خوارەوە بەدیاری دەخەن ۰

**نەخشەی یەکەم**

——————— ،

... ... ... ... ،

... ... ... ... ... ۰

## نەخشەی دووەم

رستەی ،

رستەی شوێنکەوتوو .

سەرەکی .

رستەی شوێنکەوتوو .

## نەخشەی سێیەم

رستەی ،

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری

سەرەکی

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری

لەزمانی کوردیدا چەشنی ئەمانە زۆرن . بۆ نموونە :

ئەو کەسەی ،

کە بیەوێ لە بناوانی کوردو مێژوویان بکۆڵێتەوە

ئەبێ چاووی لەو قەومانەشی بێ

کە لە کێوەکانی کوردستان پێکەوە ژیاون ، وەکو ئاسورو

تورکمان و ئەرمەن . ( م . ئە . کوردی )

ئەو هەڵبەستانەی ،

کە لێرەدا پێشکەشی دەکەم ،

تەنها بریتیە لەو شعرە پوختانەی ، ۱

کە پیرەمێرد ووتوویەتی . ( د . پیرەمێرد، ل ـ ۱۰ )

بێ سەروی رەوانم ،

کە لەبەر ئەشکی رەوانم

خەرقە بووەتە غەرقە

کەوا سەوزە لەبەرما ( د . نالی‌و فەرهەنگی ، نالی ، ل ـ ٥٠ )

مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحمودی پیرحەسەنی ،
که مەشهوور بووە بـە چاوومار
لای باوکی‌و لای شێخ مەعروفی نۆدێ‌و مەلاعەبدوڵلای رەش خوێندویەتی
که مەشهوور بووە بە مەلای رەش‌و ( شێخ الاسلام )ی
بابانەکان بوو ٠

**٣ ـ ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامرازی یەك بە دوای یەك هاتوو**

ئەم‌جۆرە رستە شوێن‌کەوتووە دیارخەریە بەئامرازە ئەوەیە ، کە لـە ناو رستەیێکدراوێکی شوێن‌کەوتووخوازدا چەند رستەیێکی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بە ئامرازی یەك بەدوای یەك هەن ، کـە یەکـەم رستەی شوێن کەوتووی دیارخـەری دەگەڕێتەوە سـەر ڕستەی سـەرەکی ، وەڕسـتەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بە ئامرازی دووەم دەگەڕێتە سەر ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بە ئامرازی یەکـــەم ٠ بەمـــەوە ڕستە شوێن‌کەوتووە دیارخەریە بەئامرازەکان دەکەونە دوای یەکەوە ، ڕستەی یەکـەم دەکەوێتە دوای ڕستەی سەرەکی ، ڕستەی دووەم دەکەوێتـە دوای ڕستەی یەکـەم ، ڕستەی سێیەم دەکەوێتە دوای دووەم‌و هەروەها تا زنجیرەیێی نەپچڕاو لـە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز دروست دەکەن ٠ هەر وەك لەم نەخشانەی خوارەوەدا دیارە :

**نەخشەی یەکـەم**

________________ ،

– – – – – – – – ،

– – – – – – – –

– – – – – – – – – – ٠

**نەخشەی دووەم**

رستەی سەرەکی
رستەی شوێنکەوتووی یەکەم
رستەی شوێنکەوتووی دووەم

**نەخشەی سێیەم**

رستەی سەرەکی
رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری یەکەم
رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دووەم
رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری سێیەم
رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری چوارەم •
••• ••• ••• هتد •

هەر وەك لە نەخشەکاندا دیارە شوێنکەوتووی دیارخەری یەکەم بۆ هی دووەم دەبێتە رستەی سەرەکی و هی دووەم بۆ سێیەم دەبێتە رستەی سەرەکی‌و لەوەزیفەی ئەودا دەبێت • نموونەش لە زمانی کوردا بۆ ئیرە زۆرە هەروەك :

من لە نەتەوەی قەومێکم ،
کە لە بەرەبەیانی تاریخەوە بەم زمانە قسەئەکەن ،
کەمن قسەی پێ‌ئەکەم‌و
پێ‌ی‌ئەنووسم •
( م • ئە • کوردی ، ل ـ ٩ )

. تەنیا ئەو شوێنە سەختانە مانەوە
کە تورکەکان دەستیان نەئەگەیشتێ وەکو ناوچەی دەرسیم ،
کە عەشرەتە ئازادی خوازەکانی ( علی اللهی ) تیائەژی •
لەرستەکانی سەرەوەدا ، کە رستەیەك بە دوای یەك هاتووەکان بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەر ( کە ) بەیەکەوە لکاون‌و گەیشتوونەتە یەك •

## لقی ٥ : جێگای رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز بەپێی رستەی سەرەکی لە ناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

١

هەروەك دیارە ، رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر ووشەیێك لە ووشەکانی رستەی سەرەکی ، بۆیە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەکەوێتە دوای ئەو ووشەیە • ئەم جۆرە کەوتنە دوایەش کار دەکاتە سەر جێگای رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز لەناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازداو جێگۆڕی بەرامبەر رستەی سەرەکی پێدەکات • بەم پێیە شوێن کەوتووی دیارخەری هەندێ جار دەرەوەیی دەبێو هەندێ جاری تریش ناوەوەیی • لەگەڵ ئەوەش هەر هەمان رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکە ، کە شوێنی دەرەوەیی گرتووە دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەش ، وەهی ناوەوەیش بکەوێتە دەرەوە • ئەم جێگۆڕیە سەربەخۆیەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری شتێکی تایبەتە بە زمانی کوردیەوە ، کە لە زمانانی ئێرانیدا بەرچاوو ناکەوێت ، بۆ نموونە وەکو زمانی فارسیو پوشتو ..[1] هتد •

---

(١) أ ـ روبنیچك. یو. ئا. رستەی ئاوێتەکان لەگەڵ شوێن کەوتووە دیارخەریەکان لە زمانی ئەدەبی ئێستای فارسیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩

Рубинчик Ю. А. сложные предложения с придаточными определительнымн в современном персидском Языке, М, 1959.

ب ـ کالینینە ز. م. رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لە زمانی ئەدەبی ئێستای پشتوودا . مۆسکۆ ، ١٩٦٦

Калинина З. М. сложноподчиненное предложение в современном Языке пушту, Москва, 1966.

بەمەوە سێ جێگا دەردەکەونو سێ کۆمەڵە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەریمان بەرچاوو دەکەوێت •

١ ــ کۆمەڵەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەرەوەیی •

٢ ــ کۆمەڵەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری ناوەوەیی •

٣ ــ کۆمەڵەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری سەربەخۆ •

**١ ــ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری دەرەوەیی**

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا دەتوانێ بکەوێتە دەرەوەی رستەی سەرەکی لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا :

**أ ــ ئەگەر ناوی دیارخراو بەشی ناوی خەبەر بوو :**

بۆ نموونە :

مێژووی ئەدەب زنجیرە باسکردنێکە ،

که لە گەڵ زمانو زەمانا هاتبێت•

لەم رستەیەدا کۆمەڵە ووشەی ( زنجیرە باسکردنێك ) بەشی ناوی خەبەری رستەی سەرەکیە لە هەمان کاتیشدا ناوی دیارخراوە ، بۆیە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری ( لەگەڵ زمانو زەمانا هاتبێت ) کەوتۆتە دەرەوەی سەرەکی ( مێژووی ئەدەب زنجیرە باسکردنێکە ) •

ئای لەو خۆشیە ،

کە لە ناو بەفرا کەوم ئەگرتو ئەمکرد بە هەرا•(دە پیرەمێرد ، ل ــ ٢٧١ )

**ب ـ ئەگەر ناوی دیارخراو کەوتبووە ناو هەردوو بەشی خەبەر :**

باسی ئەو شتانەی ئەکرد ،
که لەوێ دیوینی ٠ ) ج ڤێتنام ، ل ـ ٤١ (

رووداوی ئەو رۆژەی لەبیرنەچووبووەوە ،
که ئێمە پێ‌پەست بووین ٠
ئایا ئێمە لەم سەدەی بیستەمەدا ئەبێ به چ چاوێك تەماشای مەلاو شعری مەلا بکەین ،
که له دەمەدەمی سەدەی پازەهەمدا هاتوونەتەکایەوە ٠
( م ٠ ئە ٠ کوردی ، ل ـ ١٩٠ )

**ج ـ ئەگەر ناوی دیارخراو کەوتبووە نێوان پێشگرو فرمان :**

بۆ نموونە :

گەلێ شێوەی لەو وێنەیەی هیوا ئەچێ ،
که به منالی گیراوە ٠ (ژ٠ گ ٠ل ـ ٢٣)

له رستەی سەرەوەدا ناوی «وێنەی هیوا» کەوتۆتە نێوان «لەو»و«چوون» که له عاستی خۆیدا « لێ‌چوونه »ە ٠
له هیکەوە تۆپەکە بەو کورە کەوت ،
که لەوێ وەستابوو ٠
**د ـ گەر ناوی دیارخراو کەوتبووە دوای هەموو ووشەکانی رستەی سەرەکی:**

بۆ نموونە :

مەکە لۆمەی پەشێوی دڵ

که ئەمشەو پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان ٠
( د ٠ نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٨٠ )

دوو چاوم هەیە یەکێك چاووی سەر

که بۆ رێگای دوور پەنای دێتەبەر •

( د • پیرەمێرد ، ل ـ ١٩٤ )

### ٢ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامرازی ناوەوەیی

رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامرازی ناوەوەیی هەردەم بەدوای ناوی دیارخراوەوە دێت • بۆ نموونە :

ـــ کچەکەیان ، [ کە لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی جوامێر هەستابووە سەرپێ ]ێ دەنگ دلێرتر لەو وەرامی دایەوە • ( ژ • گ ، ل ـ ٥١ ) •

ـــ چەند بە سۆزە ئەی دڵەی سووتاو کزەی هاواری تۆ
دیدە ئەی ئەم هەموو ئاوە ، [ کە کردووتە بە خۆ ] ،
ئاوی زەڵم‌و تانجەڕۆ ووشکن لە چاووتا بێ‌درۆ ( د • سالم ، ل ـ ٦٢ )

ـــ ئەو حاکمەی ، [ کە عەینی وەفابوو ] حقووقی مەحضە
نەرکی سەریری مەعدەلەتی کردو هاتە لات

لە رستەکانی سەرەوەدا رستە شوێن‌کەوتووەکانی ناو کەوان رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامرازن‌و کەوتوونەتەوە ناوەوەیی رستەی سەرەکی‌و یەکسەریش کەوتوونەتە دوای ناوی دیارخراو ، کە شوێن‌کەوتووەکانیان دەگەڕێنەوە سەر •

ئەگەر ناوی دیارخراو لە عاستی خۆیدا دیارخەری هەبوون ، ئەوسا رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز یەکسەر دەکەوێتە پاش دیارخەرەکانی ناوی دیارخراوەوە ، بۆ نموونە :

— ئەو قسانەی جوامێر ، [ کـــەوا زۆرترین کـــەندیو هەرەس‌هێنانی بڕیارەکەی پێشانئەدا ] ، هیوایان لە دڵی شاهۆدا ژیانەوە • (ژ • گ ، ل ـ ١٦٣ )

— ئەم تاقمە مومتازە ، [ کەوا خاسەیی شاهن ]

ئاشووبی دڵی مەملـەکەتو قەلبی سوپـاهن ( د • نـالیو فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٨٤ )

— کۆتری ( پێکاسۆ ) ، [ کە موژدەی هێمنی هێنا ]

گوتی : مـرد بەسەرچوو رۆژی استعبادو اشـحاری کـورد ( • بۆ کوردستان ، ل ـ ١٢ )

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری هەمیسان دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی ڕستەی سەرەکی لەو حاڵەتەی ، کە پێویست‌بوو بە مەبەستی نووسینێکی ئەدە بی خەبەری رستەی سەرەکی یان ووشەیەی ، کە دەگەڕێتەوە سەر خەبەر جودا بکرێتەوە ـ بۆ نموونە :

ئەو کەسانەی، [کە ئەیانەوێ چارەی نەبوونیو کوێرەوەری و هەژاریو گیرۆدەیی خۆیان بە خواردنەوە بکەن ] ، کە دێنە سەر خۆیان ، ئەبینن نەك هەر دەردەکەیان لە کۆڵ بۆتەوە ، بەڵکو سەرباریشی هاتۆتە سەر •
(ژ • گ ، ل ـ ١٢٠ )

٣ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامرازی سەربەخۆ :

مەبەست بەم جۆرە رستە دیارخەریە ئەوەیە ، کە رستەکە بە سەربەستی دەتوانێ جێگۆڕی بکات : یانی جاری وا هەیە دەتوانێ بکەوێتە دەرەوەی رستەی سەرەکی ، هەر هەمان رستەش دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی : وەك ئەو رستە شوێنکەوتووەی ، کە لە دەرەوەی رستەی سەرەکیە

دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی یان ئەوەی ، کە لە ناوەوەی رستەی سەرەکیەدەتوانێ بکەوێتە دەرەوەی رستەی سەرەکیو هەروەها •

بۆ نموونە : دلێر لەو ژوورەدا دانیشتبوو ،

کە ئەیڕوانیە سەر باخەکە •

لێرەدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەرامبەر رستەی سەرەکی ڕستەیێکی دەرەوەیە • دەتوانرێ بخرێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی بە بێ ئەوەی کار بکاتە سەر گۆڕانی واتای رستەکە ، هەر وەك لە خوارەوەدا دیارە •

— دلێر لەو ژوورەدا ، [ کە ئەیڕوانیە سەرباخەکە ] ، دانیشتبوو •

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەتوانێ ئەم سەربەخۆیە لە جێگۆڕیدا لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بنوێنێ • بۆ نموونە :

**ا ـ ئەگەر ناوی دیارخراو موبتەدای رستەی سەرەکی بوو :**

بۆ نموونە :

مراخانیەکەشی ، [ کە بە تەنیا بەناو مراخانی بوو ] ، بەسەر سنگیا هەمیشە کرابووەوە • ( ١٠ چیرۆك ، ل ـ ٧٨ )

هەمان نموونە بە شێوەی دەرەوەیی

مراخانیەکەشی بەسەر سنگیا کرابووەوە ،

کە بە تەنیا بەناو مراخانی بووە.

**ب ـ ئەگەر ناوی دیارخراو بەرکاری یەکسەری رستەی سەرەکی بوو :**

بۆ نموونە :

مامم لە مەولەوی ئەپرسێ ، ئەم کوڕە ئەناسی ،

کە لە گەڵمە • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ص )

هەمان نموونە بە شێوەی ناوەوەیی

مامم لە مەولەوی ئەپرسێ ، ئەم کوڕە ، [ کە لە گەڵمە ] ، ئەناسی •

بیرەکەی ، [ کە هاتبووە سەری ] ، دەری نەبڕی •

هەمان نموونە بە شێوەی دەرەوەیی

بیرەکەی دەرنەبڕی ،

کە هاتبووە سەری •

**ج ـ ئەگەر ناوی دیارخراو بەرکاری نایەکسەری رستەی سەرەکی بوو :**

دیوانی مەولەوی بە دەسنووس جگە لەو زاتانەی ، [ کە وتم یارمەتیان داوم ] ، لای گەلێ کەسی تریش هەیە •

هەمان نموونە بە شێوەی دەرەوەیی

دیوانی مەولەوی بە دەسنووس ، لای گەلێ کەسی تریش هەیە جگە لەو زاتانەی ،

کە وتم یارمەتیان داوم •

**د ـ ئەگەر ناوی دیارخراو ئاوەڵکاری رستەی سەرەکی بوو :**

بۆ نموونە :

لە جێگایەکیدا ، [ کە بە بیاجلایا دەناسرێت ] ، رێگای بە سەعیدی کوڕی حاجب گرت • ( د • پ ـ چ[2] ، ل ـ ٢٢ )

هەمان نموونە بە شێوەی دەرەوەیی

لە جێگایەکیدا رێگای بە سەعیدی کوڕی حاجب گرت ،

کە بە بیاجلایا دەناسرێت •

هەموو رۆژ بەیانیان زوو ئەهاتو لە پشت مێزە شەقو شڕە شکاوەکەیەوە بە قنجی دائەنیشت ،

کـه لـه حەوشەکەی بەردەرکی سەرا
دابنابوو • ( ١٠ چیرۆك ، ل ـ ٣٨ )

ئێستە ئێمە بـە سەرە قسەی ئـەو رۆژهەڵاتی نـاس و مێژوونووسانە ئەنووسین ،

که لەلایەن ژمارەی کوردەوە دواون • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ٦٧ )

هەمان رستەکانی سەرەوە بە شێوەی ناوەوە ـ ی

ـــ هەمـــوو رۆژ بەیانیان زوو ئەهات و لــە پشت مێزە شـــەق و شـڕە شکاوەکەیەوە ، [ کە لە حەوشـەکەی بەردەرگی سەرا دابنابوو ] ، بـە قنجی دائەنیشـت •

ـــ ئێستە ئێمە بە سەرە قسەی ئەو رۆژهەڵاتی‌ناس و مێژوونووسانە ، [ کە لە لایەن ژمارەی کوردەوە دواون ] ئەنووسین •

**هـ ـ ئەگەر رستەی سەرەکی رستەیێکی ناڕێك بوو :**

بۆ نموونە :

ئەو کەسانە ، [ کە ئەڵێن زمانی کوردی فارسی‌یەو تێکدراوە ] ، دراساتی عیلمی و باســی تاریخی بەتەواوی پێچــەوانەی بیرو ڕاکەیـانە • ( م • ئە • کوردی ل ـ ٢٢ )

لە رستەی سەرەوەدا رستەی سەرەکی رســتەیێکی ناڕێکە ، چونکە ئەبووایە ووشەی « ئەو کەسانە » کە ناوی دیارخراوە نەکەوتایەتە پێشەوەی رستەی سەرەکی[١] ، بەڵکو ئەبوایە بکەوتایە دواوەی • هەروەك لە نموونەی خوارەوەدا دیارە کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری ئەکاتە دەرەوەیی :

دراساتی علمیو باسی تاریخی بەتەواوی پێچەوانەی بیروڕای ئـەو کەسانەیە ،

که ئەڵێنْ زمانی کوردی فارسییەو تێکدراوه •

شەو ئەزانی بۆچی دەورو خولی رووی تۆ ئەدەم

تابزانێ من ، [ کە پەروانەی چراتم ] ، رۆحەکەم ( د • بێخود ، ل ـ ٥٦)

دەتوانرێ لـــە رستە لێکـدراوێکی شوێنکەوتووخـــوازدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازی ناوەوەیی و دەرەوەیی کۆبکرێنەوە •

بۆ نموونە :

ـــ سەرمایەی دەستم بۆ ئەم ئیشە ٤٩٨٠ پارچە کاغەزە ، [ کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا لەمو لەوم پرسیووەو کۆم کردۆتەوە لەبارەی چۆنیەتی ژیانی ئەو شاعیرانەدا ] ،

کە من لێرەدا نووسیوومن • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ١٢ )

ـــ ئەو خوایانە ، [ کە لە ئەفسانەدا باسئەکرێن ] ، یا ئەو پیاوانە ، [ کە لە ئەفسانەکەدا ئەوترێن ] ، ئەوە ئەو پادشاو پاڵەوانانەن ،

کە مردوون •

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا هیچ کاتێك رستەی شوێن ـ کەوتووی دیـارخـەری ناکەوێتە پێشـەوەی رســـتەی سـەرەکی ، ئـەم خاسیەتەش لە هەندێ لەزمـانی هیندو ئوروپیشدا هەیە وەك لـــە زمانی فارسیو[1] روسیدا • لـــە زمانی روسیدابەتایبەتی لە قسەی سەرزارەکی

(١) بږوانه هامشی لاپەڕە (١١٠)ی ئەم کارە •

خەڵکیدا زۆرجار رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەکەوێتە پێشەوەی رستەی سەرەکی • بۆ نموونە :

«Которая мне понравилось, той матери уже нет»
«Какой вопрос ему ни задай. он навсякий ответит»

---

(١) رێزمانی زمانی روسی بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٥٤ ل – ٢٧٨
Грамматика Русского Языка част. 2 том.2 Москва, 1954.

(٢) مکرتیچێڤە م. ئا. رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لە زمانی ئەدەبی ئێستای رووسیدا ، لێنینگراد ، ١٩٥٣ ل – ٢٥ – نامەی دکتۆراو کورتەی نامەی دکتۆرا .

Мкртичева М.А. Определительное придаточное предложение в современном Литературном Русском Языке, Ленинград, 1953 стр.25 канд. дис.

## لقی ۱ : ستروکتوری رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەری بێئامـراز

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز لە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز جودا دەبێتەوە بە وەی ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز ،ئامرازی گەیەنەری نیەو بێئامرازە . بەراوردیبکە :

لەو کەسەی

دینی ئەتۆ نووری دڵ و ئیمانی‌یە

ڕوو بە زولفت دامەپۆشە یەعنی کافرستانی‌یە .

( دیوانی نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ۱۱۷ )

لـــە هەموو پێچو کـونو قوژبنو سووچێکی ئـەو شاخە قووچانە شارەزابوو ،

کە وەکو بازن لە دێ یەکەیان ئالآبون . ( چ ـ مەم )

بەراوردیەکە پیشانمان دەدات ، کە رستەی یەکەم هەمان ستروکتوری هەیە ، کە شوێنکەوتووی بەئامراز هەیەتی : لە هەردوو نموونەکاندا ناوی دیارخراو هەیە ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامرازیان دەگەڕێنەوە سەر ، وە هەردوو نموونەکان راناوی ناوی دیارخراویان هەیە ، نموونەکانی خوارەوەش بەئاشکرا ستروکتوری رسـتەی شوێنکـەوتووی دیارخەری بێئامراز پیشاندەدەن :

ئەو کەسەی

رۆژنامەی بڵاودەکردەوە ،

بە خۆیو بە رۆژنامەکەیەوە گیرا •

( تاریکو روون ـ ل ٤٠ )

ئەو ئاوەی

وەك کەوسەرە ،

کلێلە نووری چاوە • ( د • پیرەمێرد ، ل ٢٨٩ )

لە نموونەکانی سەرەوەدا ووشەکانی « کەس ، ئاو » ناوی دیارخراونو رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز « رۆژنامەی بڵاودەکردەوە ، وەك کەوسەرە » دەگەڕێتەوە سەر •

ناوی دیارخراو دەتوانێ خۆی لەناو رستەی سەرەکیدا دووبارە بکاتەوە• بۆ نموونە :

هەموو کەوتنە خەباتێکی بەجۆش لە پێناوی ژیان ، ئەو ژیانەی ،

هەموو رەنجبەرو کرێکارو جووتیاران چاوەڕوانی بوون •

وردە وردە تولە رێگاکەیان دەبڕی رووەو لادێکە ئەو لادێیەی

تافی منداڵیان تێدا بردبووە سەرو هەزاران یادگاریان تێدا هەیە •

جاری واهەیە لە جیاتی یان لە وەزیفەی ناوی دیارخراو راناوی نیشانەی نزیك و دوور بۆ تاك یان کۆ بەکاردەهێنرێ • بۆ نموونە :

کێوەکانی رۆژئاوای ـ زیاتر ئەوانەی

بە سەرئێرانو تورکیادایە ،

بێدارستانو بەردەلاّنن •
(م • ئەکوردی ل ـ ٦٣)

راناوی ناوی دیارخراویش دەور لە دروستکردنی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەبینێ ...[1] • بۆ نموونە
ئەو منالەّی
ئەیبینیت ئاوەها قنجو قیت لە بن دەستی ئەو پیرەمێردەدا
دانیشتووە ،
تائێستاش کەس نازانیت کێیە ؟ !

لە نموونەی سەرەوەدا « ی »کە بە پێشگری فرمانی خەبەری رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازەوە لکاوە « بینین » راناوی ناوی دیارخ اوە لکاوە لە هەمان کاتیشدا بەرکاری یەکسەری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازەو نیابەتی ووشەی « منالّ » دەکات ، کە لە ناو رستەی سەرەکیدایە • ئەم راناوێ ناوی دیارخراوە پەیوەندیو پەیوەستی بە یەکەوە بەستنەوەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازو ناوی دیارخراو بەتین دەکات . کە بەهۆی ئیزافەتەوە بە یەکەوە لکاون •

لە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی شوێن یەك کەوتوودا راناوی ناوی دیارخراوی لکاو دەتوانی ببێتە بەشێك یان جۆرەها بەش لەبەشەکانی رستەی شوێنکەوتووی بێئامراز ...[2] • بۆ نموونە :
ئێمە هەموومان بە وەبیرهاتنەوەی ئەو رووداوەی ،
پارێکە لەم کاتەدا دزەکە بەرپای کرد هەموو سالّ خەلّك بیری
ئەکاتەوە ،
دلّ تەنگو عادز بووین •

---

(١) بڕوانە لقی دووەم ـ بەشی یەکەمی ئەم کارە .
(٢) بڕوانە لقی سێیەمی ئەم بەشە .

بۆ ئەو کەسەی

لە پشتەوە ئەت‌پێکێ

لەچاووی «ئەو» ئەبێ تێ‌بکەی پێکێ

لە رستەی یەکەمدا دوو شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز هەیە ، کە بەیارمەتی ئامرازی « و »ی پەیوەست بەیەکەوە بەستراونەتەوە • لــە هی یەکەمدا راناوی ناوی دیارخراو کەوتووە ، بەڵام لە هی دووەمدا راناوی ناوی دیارخزاو بەرکاری یەکسەری رستەکەیە

نموونەش بۆ ئەوە زۆرن وەك :

یەکێك لەو شتانەی ،

تەرجەمەکران

و

منیش لە تەرجەمەکردنی‌دا بەشداربووم

ئالەکۆکی هەژاربوو •

لە رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری یەکەمدا لە نموونەکەدا بەرکاری یەکسەر نادیارەو بزرە ، ناوی دیارخراو ، کە رستــەی شــوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ ئامرازی دەگەڕێتەوە سەر خۆی لەناو راناوی کەسی فرمــانی خەبەردا نواندووەو ، لە رســـتەی شوێن‌کەوتووی دیــارخەری بێ‌ئامرازی دووەمدا راناوی ناوی دیارخراو « ی » ، کە بە ووشەی « تەرجەمەکردن » نووساوە دیارخەری ئەم ووشەیە ، کە دەگەڕێتەوە سەری •

لە دروست‌کردنی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز ووشەی تەناسوبیش ...[1] دەور دەگێڕێ ، کە راناوی ئیشارەتی دوور و نزیك نیشان‌دەدەن ، ئەم وەزیفەیە دەبینن ، هەروەها راناوی نیشانەی بارگرانی

(١) بروانە بەشی سێیەمی ئەم کارە .

دوور نیشاندەر ، « ئەو ••• ە »و نزیك نیشاندەر « ئەم •••• »و ئامرازی ناسراو « ەکە » •

**١ – ڕاناوی نیشانەی بارگران لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا لە دروستکردنی ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز**

بۆ نموونە :

نەیانتوانی ئەو شتانەی ، لەو سەردەمە وونبوون ، بدۆزنەوە •

ئەو کتێبەی ، ئێستە لەبەر دەستایە ، کردو کۆشی گەلێ ساڵە • ( م • ئە • کوردی ، ل – ١٢ )

ئەم کارەی ، ئێستا لەبەر دەستایە ، جێبەجێ‌کردنی خزمەتێکی گەورە دەبەخشێ •

لە رستەکانی سەرەوەدا راناوی نیشانەی بارگران « ئەو ••• ە » ، « ئەم ••• ە » ، کە بۆ دوورو نزیك نیشاندان بەکاردێن وەزیفەی ووشەی تەناسوبی دەبینن لە ناو لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا لەگەڵ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز • لەگەڵ ئەم ڕاناوە نیشاندەرانەش ئامرازەکانی « لە ، بە » ، کە پیانەوە دەلکێن بەکاردەهێنرێن • بۆ نموونە :

بەو دەرگایەیی ، ئەیڕوانییە ساڵۆنە تاریك‌و نووکەکە ، چەند دڵۆپ خوێنێکی تری دی • ( ١٠ چیرۆك – ل ٩٣ )

زاراوە یەکێکە لەو گیرو گرفتانەی ، تووشمان هاتوون • ( برایەتی ، ژ ٦ ، س – ١٩٧٠ )

لە نموونەکانی سەرەوەدا « بە ، لە » بە ڕاناوی نیشانەی بارگران « ئەو ••• ە » « ئێو ••• ە » لکاون •

**٢ ـ ئامرازی ناسراو « ەکە » لە وەزیفەی ووشـەی تەناسوبیدا لـە دروسـتکردنی رسـتەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ئامراز**

لەم دیالێکتانەدا ئامرازی ناسراو « ەکە » وەزیفەی ووشەی تەناسوبی دەبینێ لەدروستکردنی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ئامراز • بۆ نموونە :

ــ حاکمە بێگانەکەی ، دوای شەڕی گەورە هاتە وولآت ، رووی کردە کابایزی ماندوو و برسی • ( چ • مەم ، ل ـ ٦٨ ) •

لە نموونەی سەرەوەدا ئامرازی ناسراو « ەکە » وەکو عادەت بە ناوی دیارخراوەوە لکاوە ، کە لێرەدا ووشەی « بێگانە »یە وەزیفەی ووشەی تەناسوبی دەبینێ لـــە رستەی لێکـــدراوی شوێن کەوتووخوازدا لەگـــەڵ شوێن کەوتووی دیارخەری •

لە رستەکەدا دیـارە ، کە ئامرازی ناسراو لە وەزیفەی تەناســـوبیدا بە ناوی دیارخراوەوە دەلکێت ، بەلآم گەر ناوی دیارخراو لە عاستی خۆیدا دیارخەری هەبوو ، ئامرازی ناوبراو بە ووشە دیارخەریەکەوە دەلکێت •

بۆ نموونە :

ــ دڵۆپە ئاوەکەی ، لـــە دەنووکی باڵندەکەوە رژایە ناو غونچـە گوڵـە پووچەکە ، بووە مایەی بووژاندنەوەی •

گـەر ناوی دیارخراو یان ووشە دیارخەریەکەی کۆتایی بـــە پیتێکی بزوێن ، وەك : « ۆ ، ێ ، ا » هاتبوو لە کاتی لکاندنی ئامرازی « ەکە » لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا بە ناوی دیارخراوەوە یان بە کۆمەڵەی ناوی دیارخراوەوە پیتی « ە »ی ئامرازی « ەکە » دەکەوێت یان پیتی « ی »ی بزوێن دەکەوێتە نێوان ووشەکەو ئامرازەکەوە • بۆ نموونە :

— سۆزان ووتی ، کیلۆ هەرمێکەی ، باوکم بۆی هێنابووم ، دلی هەموو هاوڕێکانم پێ خۆش کرد •

— سۆزان ووتی ، کیلۆ هەرمێیکەی ، باوکم بۆی هێنابووم ، دلی هەموو هاوڕێکانم پێ خۆش کرد •

— هەموو سالێ یادی سەردەریاکەی ، پێی دەلێن دەریای رەش ، بە خۆشی دەکردەوە •

— هەمووسالێ یادی سەر دەریاکەی ، پێی دەلێن دەریای رەش، بە خۆشی دەکردەوە •

— پەمۆکەی ، لە دەرمانخانەکەدا دەفرۆشرێت ، لە میکرۆبی هەموو نەخۆشییەك پاککراوەتەوە •

— پەمۆیەکەی ، لە دەرمانخاکاندا دەفرۆشرێت ، لە میکرۆبی هەموو نەخۆشییك پاککراوەتەوە •

گەر ناوی دیارخراو یان وۆشە دیارخراوەکەشی بە پیتی ( ی ) کۆتاییهاتبوو هەر ئەبێ ( ی ) نەبزوێن بکەوێتە نێوان ئامرازو ناوی دیارخراو ، بۆ نموونە :

کانییەکەی دەمێکە لە حەوشی مالەوەمان دروستکراوە ، دیمەنێکی جوانی بەخشیوە •

— بەیانییەکەی ، ئێمە هەموومان تێدا زوو لە خەو هەلساین ، بەیانییك بوو پڕ لە خۆشیو شادی •

گەر ئامرازی کۆ «ان» کەوتە سەر ئامرازی «ەکە» لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا پیتی « ە »ی ئامرازی « ەکە »ی دووەم دەکەوێتو فۆڕمی ( ەکان ) درووستدەکات • بۆ نموونە :

ـــ خانووەکانی ، بە زبارە دروستکراون ، مایەی سەربلندی میللەتە لـە نیشتمان پەروەریتیدا •
ـــ قوتابخانەکانی ، خـــەلکی نەخوێندەواری تێـدا فێری خوێنـدەواری دەکرێت ، وەك ئەستێرەیێکی گـــەش لـــە نێو قوتابخانەکـانی تردا دەدرەوشێنەوە •

**٣ ـ راناوی ناوی لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا لە رســـتەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ئامرازدا**

مەبەست لە راناوی ئەو راناوە ئیشارەتانەن ، کە وەك ناوو راناو لەناو رستەدا دەوردەبینن • جا ئەم جۆرە راناوە ناویانە دەتوانێ وەك ووشەی تەناسوبی دەرکەون لە دروستبوونی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەریدا •

بۆ نموونە :
ـــ ئەوانەی ، پەیوەندیان بـەو شتانەوە هـەیە ، جێو شوێنیان دیـارە • ( ژ • گ ، ل ـ ١١٨ )
ـــ هەندێ کەس خواردنەوە بە سەرچاوەیەکی خۆشیو کامەڕانی دائەنێن بۆ ئەوانەی ، هەمـوو دەروویەکی تری خۆشیو کامـەڕانی دنیایان لێداخراوە • ( ژ • گ ، ل ـ ١١٩ )

لە هەردوو نموونەکانی سەرەوەدا راناوی ناوی ووشەی « ئەوانە »یە، راناوی ناوی رستەی یەکەم دیارخەری تەمەلوك نیشاندەرە، بەلاّم لە نموونەی دووەمدا بەرکاری نایەکسەری رستەی سەرەکیە • بەم پێیە راناوی ناوی دەتوانێ ببێتە جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی •••[1]

راناوی ناوی دەتوانێ ئامرازی « لە » بەخۆیەوە بلکێنێ • بۆ نموونە :
ـــ کەکاتی تاقیکردنەوەی سەری سـالی قوتـابیان نزیكبۆوە ، هەندێ لەوانەی ، لەوێدابوونو نەیاندەخوێند ، ترسیان لێنیشت •

---

(١) بروانە بەشی سێیەمی ئەم کارە .

# لقی ٢ : ڕێگای گەیاندنی ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز بە ڕستەی سەرەکی لەناو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

لەدیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ڕێگای گەیاندنی شوێنکە ـ وتووی دیارخەری بێئامراز بە ڕستەی سەرەکیەوە ئیزافەتو ڕاناوی ناوی دیارخراون . دەوری ئیزافەت بە ئاشکرا دیارە ، لەو کاتەی ، کە ڕاناوی ناوی دیارخراو نیەو بزرە....[1] . هەروەها دەوری ڕاناوی ناوی دیارخراویش بە ئاشکرا دیارە لەو کاتەی ئیزافەت دیار نیەو بزرە ..[2] . بۆ نموونە :

— دەرچوونی قوتابیان ئەوڕۆژەیە،ساتەکانی یەکە یەکە بخرێتە پێش چاوو.

لە ڕستەی سەرەوەدا ئیزافەت نیە بۆیە ڕاناوی ناوی دیارخراوی لکاو « ی » ، کەبە ووشەی « ساتەکان »ەوە لکاوە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامراز بە ڕستەی سەرەکیەوە دەلکێنێو لە هەمان کاتیشدا بەرکاری نایەکسەری ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازە .

— لە پڕ ڕێبوار هەڵسایە سەرپێو ووتی ، بۆ ماسی گرتن با بڕۆینە ئەو ڕووبارە ، جاران ماسی زۆرمان تێدادەگرتن .

— سەرێك بدەن لەو ڕەزە ، باوکم پارێکە میوەیێکی زۆری لێوەهێنا .

---

(١) بڕوانە لاپەڕە ( ١٤١ ، ١٤٢ ، ١٤٣ )ی ئەم کارە .
(٢) بڕوانە لاپەڕە ( ١٣٦ و ١٣٧ )ی ئەم کارە .

— هەموویان هاواریان ئەکردو دەیانپرسی ، ئەو گەرمایە ناخۆشە چییە ، رووی کردۆتە ولاتەکەمان •

لە رستەی سێیەمدا راناوی ناوی دیارخراوی « ی » لکاو بە بەشی ناوی فرمانی بارگران « روولێکردن » رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرواز بەرستەی سەرکیەوە دەلکێنێ ، و لە هەمان کاتیشدا فاعیلی نادیاری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازە •

## ١ – دەوری ئیزافەت لە لکاندنی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز بە رستەی سەرەکی

ئیزافەت، ئەو مەرفیمەیە، کە دیارخەر بە ووشەی دیارخراوەوە دەلکێنێ• لەدیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ئیزافەت یەك فۆرمی هەیە « ی » بۆ نێرو بۆ مێ لە تاكو کۆدا ، بەلام لە دیالێکتەکانی سەرووی زمانی کوردیدا جۆرەها فۆرم بەکاردەهێنرێ بۆ تاكو بۆ کۆ ؛ بۆ نێرو مێیش[1] •

---

(١) أ – کوردۆییف ك. ك. رێزمانی زمانی کوردی بەراورد . نامەی دکتوراو کورتەی نامەی دکتۆرا . مۆسکۆ ، ١٩٧١

Курдоев К. К. Сравнительная Грамматика Курдского Языка (док. дис. и Авт.) М., 1971.

ب – زمانی کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٢ ( بەکاییف ج.خ ) •

Бакаев Г. Х. Язык Курдов СССР Москва, 1973.

ج – تسوکرمان ی. ی. لێکۆلینەوەیێکی رێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، سالی ١٩٦٢

Цукерман И. И. Очерск Курдской грамматики, М., 1962.

د – د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم حالەتەکانی جنس و بینای بەرکار لە زازادا ، بەغدا ، ١٩٧٧

وەزیفەی ئیزافەت لە رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا لەگەڵ شوێنکەوتووی دیارخەری لە سەر ئەوە وەستاوە، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی •

هەرکە قسە لەسەر دەوری ئیزافەت دەکرێت ، کە رێگایەکە بۆ گەیاندنی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازو بەئامراز بە رستەی سەرەکی • ئەبێ قسە لەسەر ئەوە نەکرێت ، کە ئیزافەت بە زۆری دەردەکەوێت‌و بەکاردەهێنرێت ، بەڵکو ئەبێ قسە لەسەر ئەوەش بکرێ ، کە ئیزافەت دەرناکەوێت‌و بەکار هێنانی رێك ناکەوێت •

ا ـ ئیزافەت ، لەم حاڵەتانەی خوارەوە بەکاردەهێنرێ :

١ ـ لەو حاڵەتەی ، کە راناوی نیشانەی ناوی بوو « ئەمە ـ ئەمانە ، ئەوە ئەوانە » بۆ نموونە :

ـــ مامۆستاکەمان زەردەخەنەیێکی کردو گوتی ، ئەوانەی ، لە کارەبائیش ئەکەن ، خۆیان کارەبایان نیە • ( ج ڤێتنامی ، ل ـ ١٣٢ )

ـــ تیپە جیۆلۆجیەکە وردە وردە بەرزبوونەوە تا گەیشتنە سەر تۆپەی چیاکە ، لەوێدا چەند شوێنوارێکیان دی • یەکێ لەوان ووتی ، ئەوەی، پێش ئێمە هاتووە بۆ ئێرە ، هیچی دەستنەکەوتووەو نەدۆزیوەتەوە •

٢ ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو ئامرازی ناسراوی « ەکە »ی پێوە لکابێ بۆ نموونە :

ـــ فیلمەکەی ، بۆی چووین ، فلمێك بوو لە بارەی ژیانی بووداوە • (ج • ڤێتنامی ، ل ٥٨ )

ـــ رووبارەکەی ، بەخورِ دەهاتە خوارەوە ، ناوی رووباری بەرازگر بوو •

ـــ کتێبەکەی ، دڵاوەر بۆی هێنام ، سەبارەت ئەحمەدی خانی بوو •

٣ ـ لەو حاڵەتەی ، کە راناوی ناوی دیارخراو نەبوو :

بۆ نموونە :

ـــ سەبارەت بەو دەردو پەژارەیەی ، دەساڵ کردبووم بە گەرووی کاڵیدا ، بە هەقم ئەزانی •

لەم رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازەدا راناوی ناوی دیارخراو نیە لەبەرئەوە ئیزافەت ، کە بە ووشەی پەژارەوە لکاوە ، بەکارهاتووە ، و ناوی دیارخراو بە کۆتایی خەبەری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز وەك بەرکاری یەکسەر دیارە •

ب ـ ئیزافەت ، لەم حاڵەتانەی خوارەوە بەکارناهێنرێت :

١ ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو بەشی ناوی خەبەری رستە بوو :

ـ بۆ نموونە :

بەهار ئەو کاتە خۆشەیە ، خەڵکی تێدا کامەران بێ •

ـــ کامەرانی ئەو ساتەیە ، زۆربەی خەڵك بەدواوەیەتی •

ـــ نەخوێندەواری ئەو رۆژە رەشەیە ، رێگای رووناك تاریك دەکاتەوە •

٢ ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو راناوی لکاوی « ش »ی بەسەرەوە بوو

بۆ نموونە :

ـــ ئەو کەسەش ، باوەڕی بەسەرکەوتن بێ ، ئەبێ هێزە پۆلایینیەکەی بخاتەکار •   ( م ئە • کوردی ، ل ـ ١١)

ـــ ئەو دەردەش ، بەسەر مندا هاتووە ، خوایە بەسەر کەس نەیەت •

٣ ـ لەو حاڵەتەی ، کە فرمانی خەبەری سەرەکی ووشەی « چی‌یە » بوو :

بۆ نموونە :

ـــ ئەو جوداوازی پەرستە چی‌یە ، لە نێو ئێمەدا بڵاوبۆتەوە •

ـــ ئەو پرسیارە زەحمەتانە چین ، لە تاقیکردنەوەی سەری ساڵدا بۆ قوتابیەکان هاتوون •

**٢ ـ دەوری راناوی ناوی دیارخراو لە گەیاندنی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز بە رستەی سەرەکی**

راناوی ناوی دیارخراو هەمیسان دەتوانێ نیابەتی ناوی دیارخراو بکات ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری پێ‌دەگەڕێتەوە سەر لەم شوێن‌کەوتووە دیارخەریەدا ناوی دیارخراو.خۆی دەتوانێ دووبارە بێتەوە لەناو رستەی شوێن‌کەوتوودا • بۆ نموونە :

ـــ باڵە پێش هەموو شتێکا سەرنجێ بدەینە ئەو رێگایەی ، بە لای تۆوە رێگەی هەرەراستو چاکو ئاسانە • ( ژ • گ ـ ١٦٣ )

لە رستەی سەرەوەدا ووشەی « رێگە » ناوی دیارخراوە ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازی دەگەڕێتەوە سەرو بەرکاری یەکسەری رستەی سەرەکیە ، بەڵام لەناو رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ ئامرازدا دووبارە بۆتەوەو بۆتە موبتەدای رستەکەش •

بەو پێیە راناوی ناوی دیارخراو لەناو رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازیشدا دەتوانێ ببێتە جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەکەوە، بەمەوە دەتوانێ ببێتە موبتەدا ، بەکاری یەکسەرو نایەکسەر و ئاوەڵکارو دیارخەر •

**١ - راناوی ناوی دیارخراو فاعیلی نادیاره لەناو رســــتەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازدا :**

بۆ نموونە :

ئاڵۆزی ئێستەو تاریکی دوارۆژ ئەیانگێرامەوە بۆ ڕابردوو ••• ئەو ڕابردووەی ، زیاتر دەردی گران ئەکردم • ( ژ • گ ، ل - ١٤٢ )

لەم رستەیەدا راناوی ناوی دیارخراو «ی» ، کە بە بەرکاری یەکسەری رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخەری ووشە « دەرد » لکاوە • موبتەدای رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازە ، بۆ نموونە :

— هەموو ساڵ مانگێك لەو گوندەی ، دلی دەگە شاندەوە ، نیشتەجێ دەبوو •

— جارجار بەرەو ژوور دەکەوتە ڕێ تا دەگەیشتە تۆپکەی ئەو چیایەی ، بە هاوینان بەفری بە خەڵك دەبەخشی •

**٢ - راناوی ناوی دیارخراو بەرکاری یەکسەری رســــتەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازە :**

بۆ نموونە :

— ئەو کردەوەیەی من نەبووەمایەی دووقاتبوونی ئەو ئەزیەتەی ، ئەی چێژی لە کاتی بەکارهێنانی ئەرکەکانی سەرشانتا • (ج•فێتنامی،ل-١٠٩)

لەم رستەیەدا راناوی ناوی دیارخراو « ی » کە بە ئامرازی دروست - کردنی کاتی ئێستا لکاوە لـە فرمانی « چێشـــتن »دا بەرکاری یەکســەری رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازە •

— کاباێز ، چاووەکانی راهاتبوون لە تەماشاکردنی ئەو دیمەنەی ، رۆژی هەزار جار دەیبینی •

— منداڵەکە لەتەك باوکیـا خەریکی هەڵپەڕینوچەپلەرێزان بوو بۆ ئـەو ئوتومبێلۆکەی تۆ دەیکڕی •

٣ - راناوی ناوی دیارخراوی لکاو بەرکاری نایەکسەری رستەی شـوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازە :

بۆ نموونە :

... ئەو ووشانەی ، پێیان دەگوترێ ناوی مادده « اسم المادة » ، بـە گوێرەی ماددەی مادیەتیان دەکرێن بە سێ بەشی لەیەکەی جودا . ( گ . ک . ب[1] ، بەش[1] )

لەرستەی سەرەوەدا راناوی ناوی دیارخراو « یان » کە بە ئامرازی « پێ » لکاوە ، بەرکاری نایەکسەری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازە .

— رۆژنارۆژێك رێی دەکەوتە لای ئـەو رۆژنامە فرۆشەی ، جـارجـار رۆژنامەو گۆڤاری لە لایەوە بۆ دەهات .

— دەستی خوێندکارە کەشی گرتو بردیە لای ئەو مامۆستایەی ، دەرسی لەلای دەخوێند .

٤ - راناوی ناوی دیارخراو ئاوەلکاری رستەی شوێن کەوتووی دیارخـەری بێئامرازە :

بۆ نموونە :

دەستی درێژکرد بۆ هەموو ئەو خانووە دوو نهۆمیانەی ، ئـەو منالآنە تێدا ئەژیان . ( ١٠ چیرۆك ، ل - ٩ )

راناوی ناوی دیارخراو « تێدا » ئاوەلکاری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازە .

— کابایز ئەو هەموو کونانەی ، جانەوەرو زیندەوەری بە زیانی لێوە دێنە دەر قایمو توند گرتن .

کتێبێکی چاکی مـەلا مەزبوورە کەوتە ئـەو کونەی ، هـەوای تێدا دەخولایەوە .

م ـ راناوی ناوی دیارخراو دیارخەرە بۆ تەمەلوك لە رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز :

بۆ نموونە :

ــ لە سەرێکی تریشەوە ئەوالەی ، بە بەرزبوونەوەو رێزگرتن لەومەوە چاویان بەرایی نەئەدا ببینن ، هەموو جۆرە تەلەکەبازێکیان لەگەڵا ئەکرد •

( داماوی موکریانی ، ل ـ ١٠ )

لە رستەی سەرەوەدا راناوی ناوی دیارخراو « یان » ، کە بە ووشەی « چاوو »ەوە لکاوە • دیارخەری رستەکەیە ، وەك بڵێین ، چاووی ئەوان == چاوویان •

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا حالەتێکی کەمیش هەیە ، کە لە شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازدا راناوی دیارخراو بەکارنایەت •

راناوی ناوی دیارخراو لەم حالەتانەی
خوارەوە بەکار ناهێنرێت

١ ـ لەو حالەتەی ، کە رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز تەنها لە مویتەداو فرمانی خەبەر پێکهاتبێ :

ــ ئەو کردەوەی ، کردت ، هیچی لێنەوەشایەوە ، ئەوە نەبێ ، کە تووشی سەر ئێشەی کردی • ( ج ڤیتنامی ، ل ـ ١٠٠ )

لەم رستەیەدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز پێکهاتووە لەموبتەدا ، کە بریتیە اە راناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك ( ت )و هەروەها لەخەبەر ، کە فۆرمی فرمانی کاتی رابردووە ( کرد ) لەچاووکی کردنــەوە هاتووە •

ئەی ئەو کەسەی ، بێدینە ، تۆ وەرە من ببینە
کاری خوا چەند شیرینە لەخواوەیە من جوانم ( د • زیوەر ، ل ـ ١١٠ )

**٢ ـ لەو حالەتەی ، کە فرمانی خەبەری رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز پێکهاتبوو لە فۆرمی فرمانی « هەبوون » یان « نەبوون » .**

بۆ نموونە :

— دەبێ گرنگی بدرێ بەو یاسایانەی ، لەناو زمانی کوردیدا هەیە .

( هەندێ بیروباوەڕی هەڵە ، ل ـ ١٠٣ )

لە رستەی سەرەوەشدا فرمانی خەبەری رستەی شوێنکەوتوو بریتییە لە فۆرمی « هەیە » کەلە چاووگی ( هەبوون )ەوە هاتووە .

ئابێ دڵی خۆت تەنگکەیت بۆ ئەو شتانەی ، لەلای ئێمەدا نییە .

**٣ ـ لەو حالەتەی ، کە بەشە سەرەکیەکانو بەشە ناسەرەکیەکانی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز لەناو رستەکەدا بەشی نادیاربوونو خۆیان لەناو فرمانی خەبەری رستەکەدا نواندبوو .**

بۆ نموونە :

— بە باوەڕی ئەو ، ئەو چاپەمەنیانەی ، بە کرمانجی ژوروو لە سوریەو لە سالآنی یەکەمی شەڕی جیهانی لە ئەستەمبوڵ دەرچوون ، سەر بەگرویی یەکەمن .

( چەند بیروباوەڕێکی هەڵە ، ل ـ ٨٠ )

لە رستەی سەرەوەدا ناوی دیارخراو فاعیلی نادیارەو خۆی لەناو کۆتایی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز نواندوە ، کە فرمانی « چوون »ە .

## لقی ٣ : تیپەکانی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز لە ناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازێك لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازدا دەتوانێ لەگەڵ رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکانی تردا بلکێت .

بەپێی یاسای پێکەوەلکانی، رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز بە رستەی سەرەکیەوە لەناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا پێکەوەلکانی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز هەیە :

١ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی .

٢ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی .

### ١ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی

لێرەدا چەند رستەیێکی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێنەوە سەر بەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی . بەم جۆرە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازانە دەوترێ شوێن یەك کەوتوو . ئەمەش لەسەر شێوەی نەخشەکانی خوارەوە پیشان دەدەین ...[1] ، بۆ نموونە :

---

(١) بروانە نەخشەکانی لاپەرە ( ٩٧ ، ٩٨ )ی ئەم کارە .

لەژێر گڵۆپی جەمسەری ئەو گەڕەکەی ،

پەیتا پەیتا خۆڵی مردووی ئەکرا بەسەریا

و

بە دەیان خۆری تیا ئاوا ئەکرا ،

وردیلکان هەڵتررووشکابوون • ( لەگەرووی مەرگەوە ، ل-٦٣)

لەم ڕستەیەدا دوو ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێنەوە سەر ڕستەی سەرەکی • ئەم دوو ڕستانەش بەیارمەتی ئامرازی پەیوەست « و » پێکەوەنووساون • هەردووکیشیان بەیارمەتی ئیزافەتی « ی »و ڕاناوی ناوی دیارخراو « ی » لە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی یەکەمدا ، کە دیارخەرە ، وە بەیارمەتی ڕاناوی دیارخراوی «تێدا» لە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی دووەمدا ، کە ئاوەڵکارە بەڕستەی سەرەکیەوە لکاون• بە هەردوو ڕستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازەکە ئەووترێن ، شوێن یەك کەوتوو ، چونکە هەردووکیان دەگەڕێنەوە سەر ووشەیێك لەناو ڕستەی سەرەکیدا ، کە ووشەی « گەڕەك »ە • لە هەمان کاتیشدا پێییان دەووترێ نەگونجاو ، چونکە لــە ناویاندا ڕانـاوی ناوی دیارخراو دەبنــە بەشی لێکجـودا لە بەشەکانی ڕسـتەی شوێنکـەوتووی دیارخەری بێئامرازدا •

ئەم ڕستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازە شوێن یەك کەوتووە ڕستەیێکی ناوەوەیە بەرامبەر ڕستەی سەرەکی • هەروەها ئەم جۆرە ڕستانەش دەتوانێ بکەونە دەرەوەی ڕستەی سەرەکی • بۆ نموونە :

— دەمەو نیوەڕۆ بوو بە کارێك لامدایە دووکانەکەی حاجی بازرگان ، ئەو حاجیەی کە

به مانگ زەردەخەنە توخنی لیوەکانی نەئەکەوت

و

رووخۆشی لە چارەیا تۆرابوو .

رستەی سەرەوە رستەیێکی شوێن یەك کەوتووە ، لە هەمان کاتیشدا رستەیێکی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازی گونجاوە ، چونکە تیاندا راناوی ناوی دیارخراو یەك وەزیفە دەبینن . لە هەردوو رستەکەدا ، کە دیارخەرن . ئەم جۆرە رستە شوێن کەوتووە دیارخەریە بێ‌ئامرازە گونجاوە بە یارمەتی ئامرازی پەیوەستی « و »ەوە بەیەکەوە نووساون .

لە رستە شوێن‌کەوتووە دیارخەریە بێ‌ئامرازە شوێن یەك کەوتووەکانی سەرەوەدا دیارە ، کە راناوی ناوی دیارخراو دەورێکی گرنگی تەواو دەبینێ لەگەیاندنی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز بە رستەی سەرەکی .

راناوی ناوی دیارخراو دەتوانێ ببێتە جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستە شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازو یان بە بەشێك لە هی دووەم ـ مەبەستمان رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری نەگونجاوە ، وە لە هی دووەمدا مەبەستمان هی گونجاوە ـ .

**ا ـ رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازی گونجاو :**

لێرەدا راناوە ناوە دیارخراوەکان دەبنە بەشی گونجاو لە بەشەکانی رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازدا . بۆ نموونە :

وریا بە ئەو کەسەی ،

ناوێکی باشی نیە

و

ناوبانگی بەدناوی هەیە ،

دوستایەتی لەگەڵدا مەکە .

( م . ئە . کوردی ، ل ـ ٦٤٨ )

لە رستەی سەرەوەدا شوێنکەوتووی دیارخەری گونجاو دیارە، کەلە هەردووکیاندا هەردوو راناوە ناوە دیارخراوەکان « ی ، ی » کە بە وشەکانی « باش ، ناو »ەوە لکاون ، دیارخەرن بۆ تەمەلوك ، وە ووشەی کەسَ دیار دەخەن .

هەتا ئەوانیش ئەیانزانی ، کە ئەو قوتابخانەی ،

منداڵانی لادێکەی لێدە-
خوێنن
و
جووتیـارانی لێ فیـرە
خوێنـدنو نووسـین
دەکرێن
جێگایێکی پیرۆزو بەرزە .

لە هەردوو رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە گونجاوەکەی سەرەوەدا ، ووشەکانی راناوە ناوە دیارخەریەکانی (ی ، ی) لە لەفۆڕمی (ی‌لێ ، ی‌ێ) ، کە بە ووشەکانی ( لادێکە ، جووتیاران ) لکاون بەرکاری نایەکسەری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازن . ئەم رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازە گونجاوە دەکەوێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی ، وە دەشتوانن بکەونە دەرەوەی رستەی سەرەکی . بۆ نموونە :

دەستە دەستە خەڵك دەکەوتنە رێ بەرەو ئەو تۆپکە هاوینەهەوارەی ،

ژمارەیێکی‌زۆر لە قوتابیانی زانکۆی بەغدای لەسەربوون
و
کۆمەڵ کۆمەڵ چادری جوانیان لەسەر هەڵدابوون.

لەرستەکەی سەرەوەدا ووشەکانی « لەسەر ، لەسەر » ، کە ئاوەڵکاری شوێنن ، راناوی ناوی دیارخراونەو دەگەڕێنەوە سەر ووشەی « توپکە هاوینەهەوار » ، کە ناوی دیارخراوە • ئەم رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازە کەوتۆتە دەرەوەی رستەی سەرەکی •

**ب ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی نەگونجاو :**

لەم تیپەدا راناوە ناوە دیارخراوەکان دەبنە جۆرەها بەش لە بەشەکانی لێکجودای رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز • راناوی ناوی دیارخراو دەتوانێ ببێتە فاعیلی نادیاری رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی لێك جودای یەکەموە لە هی دووەمدا دەبێتە بەرکاری یەکسەری یان نایەکسەری وەیان ئاوەڵکار یان دیارخەر ••• هەروەها • بۆ نموونە :

تیپە گەڕۆکەکە گەیشتنە سەر ئەو دەریایەی ،

نەوتێکی زۆری لێ دەر دەهێنرا

و

شەماڵێکی خۆشیشی لە ئێوارانداا دەبەخشی •

لەم رستەیەدا ، راناوی ناوی دیارخراو « ی لێ » ، « ی » لە هەردوو رستەی شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازەکە وەزیفەی لێکجوداو نەگونجاو دەبینن وەك ، لە هی یەکەم ئاوەڵکاری شوێنە ، بەلام لە هی دووەم فاعیلە • بەمە رستەیەکی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی نەگونجاوە •

رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامـرازە نەگونجاوەکان دەتوانێ دووجێگا وەرگرن بەرامبەر بە رستەی سەرەکی • دەتوانن بکەونە دەرەوەی یان ناوەوەی رستەی سەرەکی • بۆ نموونە :

ئەوسا رادیۆکەیان لا بوبو بەدوا رۆژە پڕ لە کامەرانیەکەی ،

هەموویان شەوو رۆژ خەویان پێوە دیوە

و

هەمیشە لە بیرو هۆشیاناسروەتی نەبووە •

راناوی ناوی دیارخراوی « پێوە » لە رستەی شوێنکەوتووی یەکەمدا بەرکاری یەکسەرە ، و راناوی ناوی دیارخراوی « ی » لکاوە بە ووشەی « بیرومت » لە شوێنکەوتووی دیارخەری دووەمدا موبتەدایە • ئەم رستە شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازە نەگونجاوە دەکەوێتە دەرەوەی رستەی سەرەکی •

مومکین نیە ئەو گەلانەی ،

لە جێگەی جیا جیا ژیابن

و

رووداوی لەیەکدی جیا کاری تێکردبن

لە ئەنجامی هەزاران سالی ئەو جیاوازیە ، هەر وەك یەك بن •

(گ • ك • ب[1] بەشی[1] ، ل ـ ٤٤)

راناوی ناوی دیارخراو لە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری یەکەمدا نیابەتی ناوی دیارخراو لە ناو کۆتایی فرمانی خەبەری رستەی شوێنکەوتودا هەستی پێدەکرێ ، وە راناوی ناوی دیارخراو نیە ، بەلام لە شوێنکەوتووی دووەمدا راناوی ناوی دیارخراو « تێ » بەرکاری نایەکسەرە ، ئەمەش رستەیێکی ناوەوەی رستەی سەرەکیە •

**٢ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەرێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی**

جۆرەکەی تری رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازی بێئامراز • لەو حالەتەدا بەدەردەکەوێت ، کە دوو یان زیاتر لە رستەی شوێنکەوتووی

دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر جۆرەها بەش لە بەشەکانی رستەی سەرەکی بۆ نموونە :

جارێکی تر لە سەر باڵی ئەو فریشتەیەی ،
بە ئاسمانی کامەرانیا
فڕانبووی ،
کەوتەوە خوارێ بۆ ناو چایخانەی رەق و تەق ، ساردو سڕ بۆ ناو ئەو مەردمانەی ،
لەبەر بێبیشی و بۆشی ژیانیان ئەبردە سەر بەستی و تاقەت چوونەوە بە دەم باوێشک و تاولەو دۆمینەوە . ( ١٠ چیرۆك ، ل - ١٠١ )

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی یەکەم دەگەڕێتەوە سەر ووشەی « فریشتە » ، کە دیارخەری ووشەی « باڵ »ە ، لە ناو رستەی سەرەکیدا ، وە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی دووەمیش دەگەڕێتەوە سەر ووشەی « مەردمان » ، کە ئاوەڵکاری شوێنی رستەی سەرەکیە . رستەی سەرەکی ، وە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی دووەم کەوتۆتە دەرەوەی رستەی سەرەکی . بەراوردی بکە :

قوتابیەکانی پۆل هەموو ئەوانەی ،
شتیان پێ هەڵنەگیرا ،
دابەش کران بە دەورو بەری گردەلۆکەکەی
چادریان لەسەر هەڵدابوون .

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی یەکەم دەگەڕێتەوە سەر ووشەی « ئەوانە » کە بەرکاری یەکسەری رستەی سەرەکیە ، وە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازی دووەم دەگەڕێتەوە سەر ووشەی « گردەلۆکە » ، کە ئاوەڵکاری کاتی رستەی سەرەکیە . رستەی شوێنکە -

- وتووی دیارخەری یەکەم دەکەوێتە ناوەوەی رستەی سەرەکی ،وەهو دووەم دەکەوێتە دەرەوەی •

هەڵی گرم بۆ ئەو کاتەی ،

رژێمی راستی

ئەگاتە دەمی ئەو کەسانەی ،

بەخو نی خواستی (د • دیلان ، ل ـ ٥٥)

## لقی ٤ : ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر شوێنکەوتووەکانی تر لە ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا

لـە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ڕسـتەی شـوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر شوێنکەوتووەکانی تر لە ناو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا ، وەك : شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامراز ، شوێنکەوتووی بەرکاری ، ئاوەڵکاری ، ئامانجیو ئەنجامیو ... هتد .

**١ - ڕسـتەی شـوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر شوێن کەوتووی دیارخەری بەئامراز**

بە هەموو هیزی خۆی کەوتە ڕاکردن بەرەو سەری ئەو کۆلانەی ،
که ئەیتوانێ بە چەند دەقیقەیەك لێوەی پێچ بکاتەوە بۆ هاتنە سەر ئەو شەقامەی ،

ئەچێ بۆ ماڵی مامانەکە . (ژ گ . ، ل - ١٧)

زمان ،

که هۆیەکە لەو هۆیانەی ،

ئادەمیزاد بە کۆمەڵەوە دەبەستێ ،

لـە سەرەتای دەست بـە پەیدابوونیەوە تـا دوا شێوەی داچەسپاندنی ئەمڕۆی ڕێزە ڕووداوێکی دیوە . ( سەرنجێ ، ل - ٨ )

**٢ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری**

بڕوام ئەکرد ، کە رۆژێك لە رۆژان ئەمانەی ،

لە ژێر ئەم خاکەدا راکشاون‌و پڕواون، ئێسك‌و پێسکیان
بووە بە خۆڵ ،

مرۆڤێك بوون وەکو من •

ووتی پێ‌بڵێ ، مامە پەشیمان بوویتەوە لەو کردەوانەی ،

دەربارەت کردوم •

( م • ئە • کوردی ، ل ١٢٢ ( ١٢٤ )

**٣ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن کەوتووی ئامانجی**

حەز بەوە دەکەم ، کە باسەکە بخەمە بەردەم هەموو رۆشنبیران ، بۆ ئەوەی لێ‌بکۆڵنەوە لێی‌بدوێن‌و ئەنجامی لێدوان‌و لەسەر نووسینی ئەوان بڕیارێکی عیلمی بدا بەو ئەنجامەی •

من گەیشتوومێ • ( سەرنجی ، ل ـ ٤ )

**٤ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن کەوتووی ئامانجی**

دەمێك بوو زەردەخەنەی وەهای بە لێوی مام رۆستەم نەدیبوو ، بۆیە دەریایەکی بیرەوەری رژایە یادی‌یەوە ، یادی ئەو رۆژەی ،

چۆن مام ڕۆستەم لە هەرەتی لاوێتیا بوو •

( ١٠ چیرۆك ، ل ـ ٥٧ )

ویستی قسە بکات، گریان بەری گەرووی گرت، بۆیە سەری شۆڕکردو
بێدەنگ رووی کردە ئەو رۆژەی ،

بۆیان دانابوو • ( ژ • گ ، ل ٢٢٥)

**٥ – رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز
دەگەڕێتەوە ســـەر رستەی شوێن کەوتووی کاتی**

دەمەو نیوەڕۆ بوو ، کە بەکارێك لامدایە دووکانەکەی حاجی بازرگان ،
ئەو حاجیەی •

بە مانگ زەردەخەنە توخنی لێوەکانی نەئەکەوت و خۆشی لە
چارەیا تۆرابوو • ( لە گەرووی مەرگەوە ، ل – ٧)

**٦ – رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز
دەگەڕێتەوە سەر رستەی شوێن کەوتووی مویتەدایی**

دیارە ، ئەوانەی ،

لەرێگای قلشتانەوەیەوە ئەڕۆن ،

ئەبێ تەوژمیان هەبێ و نە منـاڵی ورد • ( کلاڤەیێك
ژانی تورە ، ل – ٦٤)

**٧ – رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخەری بێئامراز
دەگەڕێتەوە سەر رستـەی شوێن کەوتووی ناچارەیی**

نامەکەت لە تووشە ئەگرم ، تا هەمیشە لەبەر چاووم بێت ، ئەگەرچی
ئەو چاووانەی •

جاران بە تەنها هەر بۆیان ئەدی ،

کوێربوون •

( لە گەرووی مەرگەوە ، لـ٥٠)

دڵت نایەشێنم ، هەرچەندە ئەو دڵەی ،

تۆ هەتە ،

بە هیچ رازی نابێ •

لە هەردوو رستەکانی سەرەوەدا ، رستەی شوێنکەوتووی بێ ئامرازەکانی ( جاران بە تەنها تۆیان ئەدی ، تۆ هەتە ) دەگەڕێنەوە سەر شوێنکەوتووەکانی ( ئەو چاوانە کوێربیوون ، ئەو دڵە بـــە هیچ رازی نابێ ) ، کـــە رستەی شوێنکەوتووی ناچارەبێن و بە ئامرازەکانی گەیەنەر ( ئەگـەرچی ) لـە هی یەکەمدا ، وە ( هەرچەندە ) لە هی دووەمدا گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی •

## لقی ٥ : جێگای ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامراز لە ناو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا بە پێی ڕستەی سەرەکی

ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامراز دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی ڕستەی سەرەکی هەروەها دەشکەوێتە دەرەوەی • وەزعیەتی جێگای ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لەسەر ناوی دیارخراوەوە وەستاوەوە لەسەر کۆمەڵە ووشەوە ، چونکە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامراز ئادەتەن هەر بەدوای ناوی دیارخراوەوە یان کۆمەڵەی ناوی دیارخراوەوە دێت •

### ١ ـ ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ئامرازی ناوەوەیی

ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ ئامراز دەتوانێ بکەوێتە ناوەوەی ڕستەی سەرەکی لە نێو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا لەم حاڵەتانەی خوارەوە :

أ ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو موبتەدای ڕستەی سەرەکی بێت •

بۆ نموونە :

ئەو دوو یاساوڵەی ، [منیان هێنا] ، نەیان ئەناسیت •(ژ •گ، ل ـ ١٤٧)

ئەو قسانەی ، [ئەو کردوونی] ، زۆربەی وەڵامی خۆی بوون •

ئەو چیرۆکانەی ، [ تەرجەمە کران ] ، زیاتر پۆلیسیبوون • ( تاریکو روون ، ل ـ ١٤ )

ب ـ لەو حاڵەتەی : ناوی دیارخراو بەرکاری یەکەری رستەی سەرەکیبێت •

بۆ نموونە :

ئەو قسانەی : [ دان ناوە لای حاکم بیانکەیت ] ئێستە لای من بیانکە• (ژ • گ ، ل ـ ١٣٢ )

ئەو کەسانەی : [ تۆ ناویان ئەبەی ] ، من عەمر ناشیانناسم • (ژ • گ • ل ـ ١٠٤ )

ئەبوایە دوای ئەو قسانەی ، [ دایکی بۆی گێڕابووەوە ] ، بچوایە • ( چ • مەم : )

ج ـ لەو حاڵەتەی : ناوی دیارخراو بەرکاری نایەکەری رستەی سەرەکیبێت •

بۆ نموونە :

— ئاغا سەیرێکی کردو بە قسەی یەکێك لە وانەی ، [ لە لای راستیەوە دانیشتبوون ] گرمەی پێکەنینی بەرزبۆووە • ( ١٠ چیرۆك ، ل ـ ١٩٠)

— بە جۆرێکی پێشەکی دەڵێم ، هەموو ئەو ئاوەڵناوانەی • [ بە پیتە دەنگدارەکان کۆتاییان هاتووە ، وەك « جوان ، بەرز ، خۆش » ] ئێستی مەعنایان لێوەردەگیرێ بە ئیزافەی ( ی ) واتە پیتی ئیزافە لە کۆتایی وشەکەدا • ( گ • ك : ب ، بەش ، ل ـ ٩(٠٧))

## ٢ ـ رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازی دەرەوەیی

ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز دەتوانێ بکەوێتە دەرەوەی ڕستەی سەرەکی بەرامبەر بە خودی ڕستەی سەرەکیەوە • ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامرازی دەرەوەیی لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا کەم بەرچاوو دەکەوێت ، ئەم جۆرە ڕستە شوێن‌کەوتوانەش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەدەردەکەون •

أ ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو لەناو ڕستەی سەرەکیدا دووبارە بکرێتەوە :

بۆ نموونە :

— سەری سوڕما لە چۆلی شەقامەکە ، ئەو شەقامەی ،

ئێوارانی تر خەڵك ڕیچکە یان تیائەبەست • ( ژ • گ ، ل ـ ١٥ )

— ئیسرۆ هەموو خوێندکاران بەرەو بەختیاری ئەڕۆن ، ئەو بەختیاریەی ، بەدەرچوونیان لە پۆلێکەوە بۆ پۆلێکی تر هاتۆتەدی •

ب ـ لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو ئاوەڵکار بوو بۆ پیشاندانی بنکەی کوتایی جوڵانەوەی ڕستە •

بۆ نموونە :

— بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی ،

دەنگە کەی لێوە ئەهات •

— هەموو ئێواران تیپە برادەرەکە بە پیاسە ئەچوونە سەر ئەو گردەلۆکەی، شەماڵێکی خۆشی دەگرتەوە •

### ٣ - رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێئامرازی سەربەخۆ

رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز ، کـە دەکەوێتـە ناوەوەی رستەی سەرەکی دەتوانێ بکەوێتە دەرەوەی ، ئاواش رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز ، کە لە دەرەوەی رستەی سەرەکیدایە دەتوانێ بکەوێتە ناوەوە •

ئـەم جێگۆڕی سەربەخۆیەی رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەری بێئامرازە لەم حالەتانەی خوارەوەدا بەدەردەکەون •

أ - لەو حالەتەی ، کە ناوی دیارخراو بەرکاری نایەکسەری رستەی سەرەکی بوو •.

بۆ نموونە :

— شانۆی ئەمڕۆمان ئەبێ رۆژنامە بێت بۆ ئەو کەسانەی ، ناتوانن رۆژنامە بخوێننەوە • ( برایەتی ؛ ژ١ = ، ل٥ ، س - ١٩٧٤ )

لێرەدا رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز ( ناتوانن رۆژنامە بخوێننەوە ) دەکەوێتە دەرەوەی رستەی سەرەکی ؛ وە لـە هەمان کاتیشدا دەتوانێ بکەوێتە ناودوەی رستەی سەرەکی - بۆ نموونە :

— شانۆی ئەمڕۆمان بۆ ئەو کەسانەی ؛ [ ناتوانن رۆژنامە بخوێننەوە ] ؛ ئەبێ رۆژنامە بێت •

ب - لەو حالەتەی ، کە ناوی دیارخراو دەبێتە یەکێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی :

بۆ نموونە :

-- جارێکی تر لەسەر باڵی ئـەو فریشتەیەی ؛ [ بـە ئاسانی کامەڕانیـ فرانبووی ] ، کەوتەوە خوارێ •

لەم رستەیەشدا ، رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری « بە ئاسانی کامەڕانیا فرانبوی » رستەیێکی ناوەوەیە ، وە لە هەمان کاتیشدا دەتوانێ

بکەوێتە دەرەوەی ڕستەی سەرەکی • بۆ نموونە :

— جارێکی‌تر لە سەر باڵی ئەو فریشتەیە کەوتە خوارێ ،
به ئاسمانی کامەرانیا فڕانبووی •

ج - لەو حاڵەتەی ، کە ناوی دیارخراو ئاوەڵکار بوو بۆ دیارخستنی ڕێچکەی جوڵانەوە :

— ئاغاو خەڵکەکەش بەرەو ئەو شوێنەی ، [ ئەڵەی لێ‌کەوت ] ، بــە پێکەنینەوە کەوتنە ڕێ • ( ١٠ چیرۆك ، ل - ١١٣ )

هەمان ڕستە لە حاڵەتی دەرەوەییدا • بۆ نموونە :

— ئاغاو خەڵکەکەش بە پێکەنینەوە کەوتنەڕێ بەرەو ئەو شوێنەی ،
ئەڵەی لێ‌کــــەوت •

— ڕامکردە دەرەوە بەرەو ئەو شوێنەی ،
دەنگەکەی لێوەهات •

( ج • ف • ل - ١٠٥ )

هەمان ڕستە لە حاڵەتی ناوەوەیی :

— بەرەو ئەو شوێنەی ، [ دەنگەکەی لێوەهات ] ڕامکردە دەرەوە •

ء - لەو حاڵەتەی ، کە ڕستەی سەرەکی ڕستەیێکی ناڕێك‌بوو :
بۆ نموونە :

— بە ڕاستی مرۆی چاکن ئەو بێگانانەی ،
مێردەکەت ڕزگارئەکەن ( ج • ف • ، ل - ١٣٧ )

لە ڕستەی سەرەوەدا ڕستەی سەرەکی ڕستەیێکی ناڕێکە ، چونکــە موبتەدای ڕستەکە کەوتۆتە پاش خەبەری ڕستە ؛ کە وشەی « بێگانە »ەیە لێرەدا . گەر ڕستە سەرەکیەکە ڕاست‌بکرێتەوە ، ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز دەکەوێتە ناوەوە • بۆ نموونە :

— بەڕاستی ، ئەو بێگانانەی ، [ مێردەکەت ڕزگار ئەکەن ] ، مرۆی چاکن•
( ج • ف • ، ل - ١٣٧ )

لەناو رستەی سەرەکی رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخواز لەگەڵ شوێن‌کەوتووی دیارخەریدا ، کە شوێن‌کەوتووی دیارخـەری بەئامرازو بێ‌ئامرازی دەگەڕێتەوە سەر ، ووشەی وا هـەن ،پەیوەندییەکی تەواویان لەگەڵ رسـتەی شـوێن‌کەوتوو هەیە • بـەم جۆرە ووشانەش دەووترێت ووشـەی تەناسـوبی ، چونکە تەناسـوب لەنێوان ووشەکەو رسـتەی سەرەکی‌و شوێن‌کەوتووی دیارخەری پەیدادەکات • ئەو ووشە تەناسوبیانەش ناوی دیارخراو تەعین‌دەکەن ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دەگەڕێتەوە سەرو دەوری نیشان‌کردنیش دەبینن • ناوەڕۆکی ووشەی تەناسوبی لە لایەن رستەی شوێن‌کەوتوو دەگرێتەوەو پیشان‌دەدرێت • ووشە تەناسوبیەکان باشترین‌و کاریگەرترین ئامرازن بۆ دروست‌کردنی رستەی لێکدراو ، وە باشترین هۆن بۆ پیشاندانی رووی گراماتیکی رستەی شوێن‌کەوتوو • ئەم وشانە لەگـەڵ رستەی شوێن‌کەوتوودا هاوپەیوەندییەکی پێکەوە لکـان دروست دەکـەن‌و سێماتیکی ئامرازی گەیەنەریش دووپات دەکەنەوە ، وە بەکاریش دەهێنرێن بـۆ پیشاندانی پەیوەندی سێماتیکی نێـوان رستەی سـەرەکی‌و رستەی شوێن‌کەوتوو •

ئەم ووشانە هـەر بەتەنهـا لـەناو رستەی سەرەکیـدا دەبێ ، ئەوەش نیشان‌دەدات ، کەوا رستەی شوێن‌کەوتوو بەڕێوەیەو شوێنی رستەی سەرەکی دەکەوێت • ووشەی تەناسوبی دەتوانێ ببێتە بەشێك لە بەشەکانی رستە ، کە لەلایەن رستەی شوێن‌کەوتووەوە دیاردەخرێن‌و روون‌دەکرێنەوە •

هەبوونی ووشەی تەناسوبی لەناو رستەی سەرەکیدا وا دەگەیەنێ ، کە رستەی شوێن‌کەوتوو چ لە رووی رێزمانیەوە چ لە رووی واتـــــاوە سەربەخۆ نین •

ووشەی تەناسوبی لەناو رستەی سەردکیدا دوو رۆل دەبینێ • لــە رۆلی یەکەمدا دەست‌نیشانی کردەوەی رستەی شوێن‌کەوتوو دەکەن ، وە لە دووەمیشدا ناوی دیارخراو تەحدید دەکەن ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دەگەڕێتەوە سەر ، وە هەروەها بە جودایش پیشانیان دەدات •

ووشەی تەناسوبی لەناو ئەو جۆرە رستە سەرەکیانە دەبن ، کە جۆرەها رستەی شوێن‌کەوتوویان دەگەڕێتەوە سەر ، وەك : رستەی شوێن‌کەوتووی خەبەری . ئاوەلکاری ، بەرکاری ، ئامانجی‌و دیارخەری •

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا لە رۆلی ووشەی تەناسوبی لە ناو رستەی سەرەکیدا ، کە رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر فۆرمی راناوی ( سوبستانتیڤنی ) راناوی نیشانەکردن « ئەمە ، ئەمانە ، ئەوە ، ئەوانە » راناوی نیشانەکردن لەگەڵ ئامرازی دیارخەر « ە » لــە فۆرمی « ئەم ... ە ، ئەو ... ە »و راناوی دیارخەر « هەموو » ، ئامرازی ناسراو « ەکە » ، ئامرازی نەناسراو « یێك » وهۆی دیارخستنی نادیاری « هەر ، هەندێ ، گەلێ ـ گەلێك ، چەند »و ناوی هەیی وەك « ئەندازە ، رادە »و ئاوەلناوی پلەکانی بەراورد ، وەك : « کۆن » ، کۆنتر ، کۆنترین »و ووشەکانی « جۆر »و « تاقە »ش دەور دەبینن •

## ١ ـ راناوی سوبستانتیڤنی لە ڕۆلی ووشەی تەناسووبیدا :

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا لە ڕۆلی ووشەی تەناسوبی راناوی سوبستانتیڤنی نیشاندەری دوورو نزیك وەزیفە دەبینن « ئەمە ـ ئەمانە ، ئەوە ـ ئەوانە » • ڕۆلی ئەم راناوە نیشاندەرانە لەناو رستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتووخوازدا لەسەر ئەوە دەوەستێت ، کە تەحدیدی ووشەیێك دەکەن ، کــە شوێن‌کەوتووی دیارخــەری دگەڕێتەوە ســەر • واتاکــەو ناوەڕۆکیشی لەناو شوێن‌کەوتووی دیارخەریدا ڕوون دەکاتەوە •

بۆ نموونە :

— ئەمانە . کە سەر جومنەی ووشەکانی « راناوی مەند »بن لە شکڵی « چالاك »دا . رستەیێکی تر دروستدەکەن • ( وردبوونەوە ، ل ـ ١٢٤)

— تا ئەمڕۆ ئەوەی . کە وەدەستم کەوتووە . کردوومەتە کۆمەڵەیێکی چەند هەزار لاپەڕەیی‌و ناویم ناوە گەوهەری یەگانە • (د • پ • • ن ـ ب ) •

— ئەوانەی . پێکەوە دەچنە شکار ، نابێ خۆیان لەیەکتر بزرکەن •

راناوی فۆرمی نیشاندەری سوبستانتیفنی ڕۆلی وشەی تەناسوبی بەم جۆرە دەتوانێ بێتە ناوی دیارخراو ، کــە شوێنکەوتووی دیارخـــەری دەگەڕێتەوە سەر • بۆ نموونە :

— ئەوانەی. کە خۆشی ئەوێن. هەموویان گیراون • (ج ڤیێتنامی، ل ـ ٣٨)

راناوی سوبستانتیفنی دەتوانێ جۆرەهـا وەزیفەی ئەندامانی رستەی سەرەکی بینێ • ئــەم جۆرە راناوە دەتوانن بین بــە موبتەداو بەرکـاری یەکسەر ونایەکسەر . وە هەروەها دیارخەر •

ا ـ **راناوی سوبستانتیفنی موبتەدایە :**

— ئەوانە کۆبوون . کە ئەهاتن بۆ لایی‌و زۆر جـار سەریان لێئـەدا • ( ج • ڤ • ن ـ ٣ )

— ئەمانەی . دەستی ئیشارەنیان بۆ درێژدەکەم ، برای هەموانن •

— ئەمین زەکی بەگ ئەڵێ : ••• ئەمانە ، کــە لەو تاریخەدا هاتوونەتە کوردستانەوە . پاشنەوەی ئەوانــە بوون ؛ کــە زووتر هاتبــوون • ( م • ئە • کوردی . ن ـ ٣٣ )

ب ـ **راناوی سوبستانتیفنی بەرکاری یەکسەرە :**

— چوومــە سەردانی ئەوانەی . دوێنێ لــە گەشتە دوورو درێژەکــە گەڕابوونەوە •

— رووی کردە ئەمانەی بە قسەی خۆش‌و پێکەنین کاتیان دەبردە سەر •

**ج ـ راناوی سوبستانتیڤنی بەرکاری نایەکسەرە :**

— حەزی لە جل‌و بەرگی زرق‌و بریق نەبوو ، ئەیوت ئێمە جووتیارو کارگەرین نابێ چاو لەوانە بکەین ، کە جل‌و بەرگی خۆپیشاندان لەبەر ئەکەن • ( ج • ف ، ل ـ ٥٤ )

— رێبوار ووتی : سەرم سوڕما لە عاستی ئەوانە ، لە مانەش بێزاربووم ، کە تەنگیان بە باوکم هەڵچنی •

— لەوەم پرسی ، کە لەوێ وەستابوو •

**د ـ راناوی سوبستانتیڤنی بەشی ناوی خەبەری رستەی سەرەکیە :**

— گەورەی کورد سێ جۆرە خان ، بەگ ، ئاغا : خان ئەوەیە ، کە دەسەڵاتی لەناوچەکەی تێپەڕکاو شوێنی تریش بگرێتەوە • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ٦٥ )

— سینتاکس لە زانستی زماندا ئەوەیە ، کە بە وردی لە رستەی زمان دەدوێت •

— ژیانی خۆش ئەمەیە ، کە ئێستا بە سەربەستی تێدادەژی •

**٢ ـ راناوی نیشاندەر لەگەڵ ئامرازی « ە »ی ناسراو لە رۆڵی ووشەی تەناسوبیدا**

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا راناوە نیشاندەرەکانی دوورو نزیك لەگەڵ ئامرازی « ە » ناسراوی لە فۆرمی « ئەم ••• ە ، ئەو ••• ە » دەوردەگێڕن • راناوی نیشاندەری نزیك لەگەڵ ئامرازی « ە »ی ناسراویدا لـــە رۆڵی ووشەی تەناسوبیدا کـەم بەرچاوو دەکەوێت • بۆ نموونە :

— ئەدەبی کوردی بێ‌خاوەن بووە ، خزمەت نەکراوە ، بە خامی کالی ماوەتەوە ، ئەگەر هانەهانە بدرایەتو بە سەرچاوەی خوێندەواری راستەقینە ئاو بدرایەو بدرێت ، پایەی گەلێ گەلێ لە ژوور ئەم پایەیەوەیە ، کە ئێستە هەیەتی •

( م • ئە • کوردی ، ل ـ ١٦٨ )

— ئەم ئاسمانە شینە ، کە وا بەرگی ماتەمە

تحلیلی وا کراوە ، کە قوبەی غەمە ، تەمە ( د پیرەمێرد ، ل ـ ١٠٣ )

لە نموونەی سەرەوەدا دیارە ، کە ناوی دیارخراو دەکەوێتە نێوان فۆرمەکە ، یانی نێوان « ئەم » یان « ئەو » و « ە » • بەمە ئامرازی « ە » دەکەوێتە کۆتایی ناوی دیارخراوەوەو پێوەی دەلکێ • وەك لە نموونەی یەکەمدا ، بەڵام گەر ناوی دیارخراو گرووپێکی سینتاکسی بوو ئامرازی «ە» بە کۆتایی ووشەی کۆتایی کۆمەڵەکەوە دەلکێت ، وەك لە نموونەی دووەمدا •

ئامرازەکانی ( بە ، لە ) دەتوانن بەم جۆرە ڕاناوە نیشاندەرانەوە بلکێن ، بۆ نموونە :

— لەو شوێنانەدا ، کە بە پێویستم زانیبێت ، دەستکاری چۆنێتی نووسینەکەیم لە ڕووی ئیملاوە کردووە • ( ژ • گ ، ل ـ ٢٥٠ ) •

— ئەبوو هەموو جارێ‌بەم چەشنەی ، باسی ئەکەم ، چاووم بە ترۆی بکەوێ ( ج • ڤ • ل ـ ٩٠ )

— لەم گەردشی مینایە ، کە وا دەورە نە جەورە

ساقی کەرەمی سابیقە ( نالی ) مەکە ئیلمام ( د • نالی‌و فەرهەنگی نالی ، ل ـ ٦١ )

راناوی نیشانده‌ری دوور له‌گه‌ڵ ئامرازی « ده‌ » ی ناسراودا له‌ ڕۆڵی ووشه‌ی ته‌ناسوبیداو له‌ فۆرمی « ئـه‌و ... ده‌ » زۆر به‌کارده‌هێنرێت و به‌رچاوو ده‌که‌وێت . بۆ نموونه‌ :

— زانایانی کوردیش ئه‌توانن له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕێ‌ڕه‌وه‌ده‌ بن . که‌ زمانی ئه‌ده‌بی یه‌کگرتووی ئه‌م سه‌ده‌یه‌مان له‌ سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌مه‌وه‌ گرتویه‌تی‌یه‌ به‌ر ( سه‌رنجی . ل ـ ١٢ )

— ئه‌و وه‌نه‌وشه‌ی ، که‌ له‌ سای داران .
شینی مه‌رشینی گرۆی یارانن ( ده‌ بۆ کوردستان . ل ـ ١٦٦ )

— ئه‌و ڕێ‌یه‌ی ، که‌ تۆ گرتت له‌ ژینا
ئێستەش به‌ جێت‌هێشت بو ڕۆڵه‌کانت
له‌گه‌ڵ ئه‌م جۆره‌ راناوه‌شدا ئامرازه‌کانی ( به‌ . ه‌ ) به‌کارده‌هێنرێن .

بۆ نموونه‌ :

— من له‌وانه‌م چی . که‌ وا ئه‌هلی وه‌سیله‌ی مه‌سئه‌له‌ن
عامیل و ناچار و مه‌عزوور ئه‌ر بلێن هه‌ر بێنه‌ بۆم ( د . نالی و فه‌رهه‌نگی نالی . ل ـ ٧٣ )

— برای یه‌کێك بوو . له‌و ڕۆژنامه‌نووسانه‌ی . که‌ گولله‌ بارانکردنه‌که‌ی ترۆی‌یان به‌چاوی خۆیان دی . ( ج . ف . ل ـ ٨٢ )

— له‌ باسه‌که‌ی ڕۆژهه‌ڵاتناس ستراسبۆ وا ده‌رئه‌که‌وێ . که‌ وشه‌ی کورد سه‌رده‌مێك به‌و کێوانه‌ ئه‌وتران ، که‌ له‌ به‌ینی دیاربه‌کرو مۆشدان . ( م . ئه‌ . کوردی ، ل ـ ١٨ )

**٢ ـ ئامرازی ناسراوی « ه‌که‌ » له‌ ڕۆڵی ووشه‌ی ته‌ناسووبیدا :**

ده‌توانرێ ئامرازی ناسراویش « ه‌که‌ » له‌ ڕۆڵی ووشه‌ی ته‌ناسووبیدا به‌کار بهێنرێت ، ئه‌م ئامرازه‌ به‌پێی‌ی عاده‌ت له‌گـه‌ڵ ناوی دیارخـراو یان

گروپەی ناوی دیارخراو دێت ، لەو کاتەی : کە ڕاناوی سوبستانتیفی وەیان ڕاناوە نیشاندەردکان لەگەڵ ئامرازی « د »ی ناسراودا نەکەوتوونەتە پێش ناوی دیارخراوەوە . بۆ نموونە :

— هەرسێکمان لەناو کۆلیتەکەی ئێمە لە ڕۆخ ئاگردانەکە دانیشتبووین . کە ئاگرێکی نەرمی لەسەرخۆ تێدا ئەسووتا . ( چ . مەم ، ٩٦ )

ئەم ڕستەیەدا ئامرازی ناسراو « دکە » بە ووشەی ئاگردانەوە لکاوە . کە ناوی دیارخراوە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر ئامرازی ناسراو « ەکە » هەر بەناوی دیارخراوەوە دەلکێت، گەر هاتوو ناوی دیارخراو لە کۆمەڵە ووشەیێك پێك‌هاتبوو ئەوجا ئامرازی ناسراو « دکە بەکۆتایی ووشەی کۆتاییەوە دەلکێت . بۆ نموونە : .

— دەم نادەمێش ئاورێکی لە تیلسە ڕێگا باریکەکە ئەدایەوە ، کە شەقامەکەی لە گوندەوە ئەبەستەوە . ( چ . مەم ، ل ـ ٤٠ )

ئەم ڕستەیەدا ئامرازی ناسراو « ەکە » لەگەڵ گروپی ناوی دیارخراودوە هاتووە « تیلسە ڕێگا باریکەکە »وە دەکەوێتە پاش ووشەی « باریك » لەو کۆمەڵەیەدا ، ڕۆڵی ئەم ئامرازە لە گەڵی نموونەی تریش بەدەردەکەوێ وەك :

— برزۆو نازێ هەر دوو ساڵ جارێك سەریان لە برادەرەکەی ئەدا . کە لە کاتی خۆیا پێکەوە دانیشگایان تەواوکردبوو .

— گرەگری ئوتومبێلەکەی ، پێش دەرکی دووکانی حاجی ڕاگیرابوو . ئەو ناوەی هێنابووە هەژان .

**٤ ـ ئامرازی نەناسراو « یك » لە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا :**

ئەم ئامرازەش لێرەدا هەر دەتوانێ لەگەڵ ناوی دیارخراوەوە بێت . وە هەروەها دەشتوانێ لەگەڵ ئەو جۆرە ناوە دیارخراوەش بێت . کە

دەکەونە پاش هەندێ لەووشە تەناسوبیەکان ، وەك : « چەند ... [1] » ، « هەر ... [2] » ، « تاقە ...[3] » ، « جۆر ...[4] » ، « ناوی پێوانو کێشان[5] » ، وە ئاوەڵناوی پلەکانی بەراوردی ...[6] .

— لەسەر ئەو چۆمەدا پردێکیان ســـازکردبوو ، کە یەکجار زۆر کۆنو لەمێژینە بوو .

( شورە مەحمودو مەرزەنگان ، ل ـ ٧٨ )

— من لە نەتەوەی قەومێکم ، کە لە بەرەبەیانی تاریخەوە بەم زمانە ، کە من قسەی پێ ئەکەمو پێ ئەنووسم قسە ئەکەن .

ئامرازی نەناسراو « ێك » لە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا ناتوانێ بچێتە سەر گروپی ناوی دیارخراوەوە ، لێرەدا بەس دەچێتە سەر ووشەی یەکەم ، کە دیارخراوە .

گەر ناوی دیارخراو لە خودی خۆیەوە لە ووشەیێکی لێکدراو یان داڕێژراو پێك هاتبوو ئەوساکە ئامرازی « ێك » دەچێتە سەر بەشی دووەمی ناوەکەوە ، بۆ نموونە :

— مام جووتیارەکە کەوتبووە هاتوچوکردنێك ، کە لای کەس نەبیستراوەو نەبینراوە .

— بڕیاریاندا ، ئەمساڵ گەڕانو سوڕانێك بکەن ، کە قەت نەکرابێتن .

---

(١) بڕوانە لاپەڕە « ١٧٦ »ی ئەم کارە .
(٢) بڕوانە لاپەڕە « ١٧٤ »ی ئەم کارە .
(٣) بڕوانە لاپەڕە « ١٨٠ »ی ئەم کارە .
(٤) بڕوانە لاپەڕە « ١٧٩ »ی ئەم کارە .
(٥) بڕوانە لاپەڕە « ١٧٧ »ی ئەم کارە .
(٦) بڕوانە لاپەڕە « ١٧٨ »ی ئەم کارە .

### ٥ ـ ڕاناوی دیارخەری « هەموو » لە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا :

— لەبەر ئەو تکایانەی خوارەوە بەرەو ڕووی هەموو ئەوانە ئەکەمەوە ، کە ئەم کتێبەیان بەرچاوو ئەکەوێ • ( د • مەولەوی )

— هەستە هەموو ئەوانە کۆ بکەرەوە ، کە لەئاسۆی فراوانتر ئەکەنەوە • ( ژۆژی کوردستان ژ ٢٣ ـ ٢٤ ، س ـ ٩٧٥ )

بە وردبوونەوە لە هەردوو ڕستەکانی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت ، کە ڕاناوی دیارخەری « هەموو » لــە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا هەردەم دەکەوێتە پێش‌ناوی دیارخراوەوە ، وە بە هیچ جـۆرێك ناتوانێ بکـەوێتە پاش یان دوای •

### ٦ ـ هەندێ ڕاناوی تری نادیاری لە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا :

لەدیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا هەندێ ووشــەی نادیـاری پیشاندان هەن ، کە وەزیفەی ووشەی تەناسوبی دەبینن ، وەك ئەم ووشە نادیارانە گەلێك ـ گەلێ ، چەند ، هەندێ ، هەر » •

ا ـ ڕاناوی « هــەر » :

— لەپاشاوای لێهات هەر شعرێ ، کە تەعبیری لە عاتیفە بدایاتەوە وەکو غەزەل ، مەتح ، لاوانەوە ، پێی‌یان ئەووت شعری گۆرانی • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ١٥٦ )

لەم ڕستەیەدا ڕاناوی « هەر » ووشەی تەناسوبیە ، وە دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە ، کە ووشەی «شعرێ»یەو نیشانەی نادیاری بەسەرەوەیە « ێ » • بە پێی ئەمەوە ئەگەر ناوی دیارخراو « هەر »ی هەبوو لە ڕۆڵی ووشەی تەناسوبیدا ، ئەبێ ئامراز نەناسراو « ێك ، ێ »ی بە سەرەوە بێت • لەم حاڵەتەدا گەر ناوی دیارخراو لە کۆمەڵێك ووشە پێکها تبـوو ئەوسـاکـە

ئامرازی نەناسراو « یك ، یَ » بـــە ووشەی کـۆتایی کومـەڵە ووشەکەوە دەلکێت •

ــ هەر کۆمەڵە مەردمێك ، کە لە ڕەگەزو زماندا تێکەڵاو بوون ، ئەمانە بۆ خۆیان ئەبن بە قەومێکی تایبەتیو جوێ ئەبنەوە لــە کۆمەڵە مەردمێکیتر ( •• ئە• کوردی ؛ ل ــ ١٥ ) •

لەم ڕستەیەدا ئامرازی نەناسراو «یك» لەبەر حوکمی هەبوونی «هەر» بە کۆمەڵە ووشەی « کۆمەڵە مەردم »ەوە لکاوە ، کە لە عاستی خۆیدا ناوی دیارخراوە •

جاری وا هەیە ڕاناوی «هەر» لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا دەکەوێتە پێش هەندێ ڕاناوی نادیاریتر وەك : « چی ، کەس •• هتد » بۆ نموونە :

ــ هەرچی . کە تەماشای ئەکەم دوشمنە ئێستا

**ب ــ ڕاناوی هەندێ :**

کورد هەمووی موسڵمانە ، هەندێ یەزیدی نەبێ ، کە لەســەر ئاینی کۆنی کورد ماونەتەوە • ( م • ئە • کوردی ، ل ــ ٦٦ )

باوکم هـــەندێ کتێبی پێشکەشکردم ، کــە دەمێك بوو لــە بازاڕ ڕابوونەوە •

گەر ڕاناوی « هەندێ » کەوتە پێش ناوی دیارخـراوەوە، نـاوی دیارخراو ئامرازی نەناسراوی « یك ، یَ » وەرناگرێت • وە هەروەهـــا ناتوانێ بکەوێتە کۆتایی یان دوای ناوی دیارخراوەوە •

**ج ــ ڕاناوی « چەند » :**

ــ شنەی بای شەماڵێك چەند پەڕەیێکی سەر مێزەکەی فڕاندو بردی ، کە لەبیری چوو بوو شتێکی قورسیان بخاتە سەر • ( ١٠ چیرۆك،لــ٥٢)

گەر راناوی « چەند » لە وەزیفەی ووشەی تەناسویدا کەوتە پێش ناوی دیارخراوەوە ئەبێ ناوی دیارخراو ئامرازی « ێك ، یێ » وەربگرێ . بۆ نموونە :

— چەند عەشرەتێکی رەوەندی ، کە لە ژێر ئەمری دا بوون ، هەمووی لە گوندو شاراندا دامەزراند . ( د . پ . ، ل — ٨ )

لەو حاڵەتەی . کە ناوی دیارخراو پێکهاتبوو لە کۆمەڵە ووشەیێك ئەوسا ئامرازی « ێك ، یێ » دەکەوێتە سەر کۆمەڵە ووشەکە بە حوکمی هەبوونی راناوی « چەند » . بۆ نموونە :

— لە ساڵی ١٩٤٩ بەو لاوە چەند شعرو چیرۆکێکی نووسیووە ، کە بەشی زۆریان تا ئێستاچاپ نەکراون . ( ژ . گ ، ل — ٦ )

**د — راناوی « گەلێك ، گەلێ » :**

— بێخود لە ژیانیا پەیوەندی روحی و دۆستایەتی لەگەڵ دەلێ کەسی وادا بووە . کە پێشی ئەو کوچیدوایان کردووە .

— گەلێك مێژوونووسانی کوردستان ، کە دەستیان پێ نووسی دەگرێت ، لە پێش هەموو چێکیدا گەوهەری پێش دەستیان‌و دەستە گوڵی تەرازو گوتنیان سەلاحەدین‌و بنەماڵەی ئەیوبیانە .

**٧ — ناوی نەریتساتلنی ، کە واتای پێوانو پلەو ئەندازە دەگەیەنن لە وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا**

لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ووشەکانی « رادەە ، ئەندازە » بۆ نیشاندانی ماوە دەهێنرێن . ئەمانە ووشەی تەناسوبین ، هەرکە دەکەونە پێش‌ناوی دیارخراوەوە ، دەبێ دیارخراو ئامرازی ناديار « ێك ، یێ » وەربگرێ . بەمەرجێ خۆیان ناوی دیارخراوبن . بۆ نموونە :

— سمێلی هەتا بلێی پڕو ئەستوور بوو ، بەرادده‌یێك تەنیا شت بوو له ڕووی مام ڕۆستەمدا ، که سەرنجی ئەکێشا • ( ١٠ چیرۆك ، ل - ٥٣ )

— من‌و ئاسۆ لێك‌دوور دەژیان به ئەندازەی دوو شار ، که ٣٠٠ کیلـو مەتر لێك‌دووربن •

— لەپڕ فڕوکەکه بەرەو ئاسمان بەرزبۆوه به ڕاددەی چیایێك که ، ٧٠٠٠ پێ بلند بێ •

**٨ - ناوی ژماره « یەك » له وەزیفەی ووشەی تەناسوبیدا**

له ڕۆلی ووشەی تەناسوبیدا هـــەر ئاوەلناوی ژمارەیی « یەکـەم ، یەکەمین » بەکاردەهێنرێ به یارمەتی « ەمین ، ەم » • بۆ نموونه :

— تەنیاقەومی ئاشوری یەکەم قەوم بووه ، کـه توانیبێتی بچێـه ولاتی نایری یا کوردۆئین • ( م • ئه • کوردی ، ل - ٤٢ )

ناوی دیارخراو ، که ووشەی تەناسوبی ژمارەی تەرتیبی دەکەوێتـه پێش ، دەتوانێ ئامرازی نەناسراو « یێك ، یێ » وەربگرێ • بۆ نموونه :

— یەکەمین که سێك ، که پێشوازی ئەم پرۆژه پیرۆزەی کرد ، مامۆستا تەوفیق وەهبی بەگ بوو • ( یەکێتی نووسین ، ل - ١٣ )

**٩ - نەریتساتلنی له پلەی بەراورد له ڕۆلی ووشەی تەناسوبیدا**

له دیالێکته ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا پلەی بەراورد به یارمەتی ئامرازەکانی « تر ، ترین » دروست دەبێت ، ئەو فۆڕمانه دەتوانن ببنه ووشەی تەناسوبی لەناو ڕستەی لێکدراوی شوێن‌کـەوتووخوازدا لەگـەڵ شوێن کەوتووی دیارخەری • ناوی دیارخراو ، که ئەم جۆره ووشه تەناسوبیەی دەکەوێته پێش ئامرازی نەناسراو « یێك » وەردەگرێت •

— ئەم قسەیه ، که ئەیلێین ، وەنەبێ هەوا پێوان بێ ، بەلکو له ڕووی بەلگەو سوراخەوه ئەیلێین ، چونکه کۆتر چیرۆکێك ، که گەیشتۆته

ئێمە ، وەکو تەماشا ئەکرێت پڕیەتی لە ئامۆژگاری و تاقیکردنەوەو شتی بەکەڵك •

( م • ئە کوردی ، ل ـ ٩١ )

ـــ کۆنترین شتێك ، کە کەوتۆتە بەر چاوو ، جلەکانی مام زۆرابن •

ـــ زۆربەی دانیشتوانی شارەکە ڕاو تەکبیریان لە لای کالترین پیاو ئەکرد ، کە تەمەنی گەیشتبووە ٩٠ سالی ڕەبەق

**١٠ ـ ناوی وجود « جۆر » لە ڕۆلی ووشەی تەناسوبیدا**

ووشەی « جۆر » دەتوانێ لەناو رستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو ـ خوازدا ببێتە وشەی تەناسوبی ، ئەو ناوە دیارخراوەی ، کە دەکەوێتە پاش ووشەی تەناسوبی ئامرازی نەناسراوی « ێك ، ێ » وەردەگرێ • بۆ نموونە :

ـــ لە سەدەی هەژدەهەم بەم لاوە جۆرە باوەڕێك ڕووی کردبووەشاعرەکانی کورد ، کە هێنەکانی پێشوو گەلێ لێوە دوور بوون • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ١٦٠ )

ـــ فلامەرز بە توڕەییێکەوە ڕووی کردە کابرا ، ووتی ، بەخوا تۆ جۆرە کەسێکی ، کە لە جیهاندا چەشنی نەبێ •

**١١ ـ ژمارەی ناویی « تاقە » لە ڕۆلی ووشەی تەناسوبیدا**

ووشەی « تاقە » دەتوانێ ببێتە ووشەی تەناسوبی • ئەم جۆرە ووشە تەناسوبیەش دەکەوێتە پێش ناوی دیارخروەوە ، دەتوانێ ئامرازی نەناسراوی « ێك ، ێ » وەربگرێ • بۆ نموونە :

ـــ تاقە شاعرێکی شیرازی ، کە ناوی لە کوردیدا بووبێت ، هەر حافظ بووە • ( م • ئە • کوردی ، ل ـ ١٨٢ )

ـــ تاقە خوێندکارێك ، کە توانیبێتی ناوبانگی زیرەکی پەیداکات ، کوڕە جووتیارەکە بوو •

## ڕســـتەی لێکدراوی شـــوێن کەوتووخوازی لەگـەڵ شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ووشـەی تەناســوبی

شی کردنەوەی نموونەکانی خاوەن تەناسووبی لە ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا لەگەڵ شوێنکەوتووی دیارخەری وامان بۆ دەردەخات، کە دەبێ ووشەی تەناسوبی تێدا نەبێت ، لەو حاڵەتەی ناوی دیارخراو ، کـە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر ، خۆی لە ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری جیاناکاتەوە • بۆ نموونە :

— مام ڕۆستەم ، کە باوکی مریەم بوو ، نەیتوانی لەم بارەیەوە ڕای خۆی دەربڕی • ( چ • مەم ، ل ــ ٧٦ )

— کوردستان وولاتێکی شاخاویە ، هەتا بەرەو شیماڵو رۆژهەڵات بچیت هەر بەرز ئەبێتەوە تا ئەگاتە کێوی ئارارات ، کە نزیکەی هەزار پێ بەرزە • ( م • ئە • کوردی ، ل ــ ٦٠ )

— لەپەیوەندی خەباتی گەلی ئێمەو گەلی دوور وڵاتی فەنزموێلا ئەدوان ، کە ئەکەوێتە ئەمەریکای لاتینی • ( ج• ف ، ل ــ ١٤١ )

ووشەی تەناسوبی دیسان بەکارنایەت ، گەر ناوی دیارخراو ، کـــە شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر ، راناو بوو • بۆ نموونە :

— ئاسۆ بە ڕزگاری ووت ، بۆ ئێمەش ، کە وەکو ئەوان لە خەباتداین ، یەکگرتن پێویستە •

— دلێر لە دانیشتووەکاندا هەڵساو ووتی : من ، کە خۆم بەباشتر ئەبینم لەئێوە بۆ بە جێهێنانی ئەم ئەرکە ، ئامادەم •

لە هەردوو رستەکانی سەرەوەدا ناوی دیارخراو راناوەکانی « ئێمە ، من »ن ، لەبەر ئەوە لە هەردوو رستەکاندا ووشەی تەناسوبی بەکارنەهاتووە•

# ئەنجام

پرسیارەکانی سینتاکسی زمانی کوردی لەکۆڕی زانستی زمانی کوردیدا بەپێی پێویست و قووڵ باس نەکراوەو لێی نەکۆڵراوەتەوە . لە لێکۆڵینەوەکانی زمانی کوردیدا زۆر باس لە باسەکانی سینتاکسی کوردی بەس دەستیان دراوەتێ . نووسەرانی ڕێزمانی کوردی یەك لەدوای یەکەوە هەر تەنها قسەیان لەسەر سینتاکسی کوردی کردووە ، وە لە هیچ کارە زانستیەکاندا لێکۆڵینەوەیێکی سینتاکسی ئەم زمانە نابینرێ . تائێستاش لە لیتراتورای کوردیدا سینتاکس تەنها لەناو ڕێزمانی کوردیدا دەبنیرێ وەباسی سینتاکسیش هەر تەنها بەشی پلەی دووەمی گرتۆتەوە . بەشی هەرە زۆری باسەکەش بۆ مەرفەلۆگیا تەرخان کراوە . سینتاکس لەناو کتێبە ڕێزمانیەکاندا بەهەمان چاووی گشتی باسکراوەو سەیر دەکرێت بەبێ ئەوەی بە دوور و درێژی بچنە ناواخنی باسەکە. باسی تایبەتو سەربەخۆ بە کۆلینەوە لەسەر هەر باسێك لە باسەکانی سینتاکسی کوردیدا لە بینەی بەرکار بەو لاوە تا ئێستا بەر چاوو ناکەوێت ...[1]

لەم کارە زانستیەی بەردەستمان دا ئەم ئاواتەمان هێناوەتە دی وە ئەم ئامانجەشمان خستۆتە بەردەست ، کە بریتیە لە کۆلینەوە لەرستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا .

---

(١) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم حالەتەکانی جنس و بنیای بەرکار لەزازادا ، بەغدا ـ ١٩٧٧

لەسەر بناغەی نموونەکانی هەڵبژاردراوو لێکۆڵینەوەیان بە تێمی ڕستەی شوێنکەوتووخوازدا گەیشتوینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە :

١ ـ ڕستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکانی زمانی کوردی بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەر « کە » بە ڕستەی سەرەکیەوە دەلکێن ، کە دەبێتە تاقە ئامرازی گەیەنەری ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەرستەی سەرەکیەوە • لە هەمان کاتیشدا ئیزافەتو ڕاناوی دیارخراویش دەوری گەیاندنی ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەرستەی سەرەکیەوە دەبینن •

٢ ـ وەنەبێ ئامرازی گەیەنەر « کە » هەر بە تەنها ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی ، بەڵکو جگە لەوەش دەتوانێ ڕستە شوێنکەوتووەکانی تریش بگەیەنێتە ڕستە سەرەکیەکانی تر ، وەك ڕستەی شوێنکەوتووی ئەخباری ، ئامانجی ، ئاوەڵکاریو موبتەدایيو خەبەریو هیتر ئامرازی گەیەنەر « کە » لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا نابێتە بەشێك لە بەشەکانی ڕستەی شوێنکەوتوی دیارخەری•

ڕاناوی ناوی دیارخراو ـ لکاو لە وەزیفەی فاعیلی ئاڕیاری ووشەدا لە ناو ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامرازدا بەدیاردەکەوێ تەنها لەو حاڵەتەدا ، کە فرمانی خەبەری ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری فرمانێکی تێپەڕی کاتی ڕابردوو بوو •

ڕاناوی ناوی دیارخراوی لکاو لە ڕۆڵی بەرکاردا بەکارەدهێنرێت بەس لەو کاتەدا ، کـە فرمانی خەبەری شوێنکەوتووی دیارخەری فرمانێکی تێنەپەڕ بێتو لە کاتی ئێستادا • لە هەمان کاتیشدا ڕاناوی ناوی دیارخراو ـ لکاو لە ڕۆڵی بەرکاری نایەکسـەردا بەکار دەهێنرێت لە فرمـانی تێپـەڕو تێنەپەڕدا • ڕاناوی ناوی دیارخراو ـ لکاو لە ڕۆڵی بەرکاری نایەکسەردا لە گەڵ پریدلۆگەکانی « لەگـەڵ ، پێ ، لێ » وە هەروەهاش بـە لکان بـە

پریدلۆگەکانی «بۆ» راناوی ناوی دیارخراو ـ لکاو بەکاردەهێنرێت لە فرمانی تێپەڕو تێنەپەڕدا بەتایبەتی لە بینای پەسیڤدا بە یەکەوە لکانی لەگەڵ پریدلۆگەکانی « پێ ، تێ ، لێوە » .

٣ ـ لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری ناتوانێ بکەوێتە پێشەوەی ڕستەی سەرەکی رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دوو شوێنی هەیە . بەشی زۆریانی دەکەونە پاشەوەی رستەی سەرەکی وەیان ناوەوەی . وەهەروەها شوێنی سەربەخۆشی هەیە لەناو ڕستەی سەرەکیدا : ڕستەی شوێنکەوتووی ناوەوەی ڕستەی سەرەکی دەتوانێ بکەوێتە دەرەوەش .

٤ ـ لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا هۆی پەیوەستی تێوان ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامرازو رستەی سەرەکی «ی»ی ئیزافەتە .

٥ ـ راناوی ناوی دیارخراو ـ لکاو لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا لە رستەی شوێنکەوتووە دیارخەریە بێئامرازەکانیشدا دەتوانن ببنە هۆی گەیاندنی رستە بە رستەی سەرەکیەوە .

٦ ـ لەو کاتەی ، کە ئیزافەت لە رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکانی بێئامرازدا نەبێ ، تاقە هۆی گەیاندنی رستەکە بە رستەی سەرەکیەوە راناوی ناوی دیارخراوە . گەر ناوی دیارخراویش نەبوو ئەوساکە تاقە هۆی لکاندنی رستەی ناوبراو بە رستەی سەرەکیەوە ئیزافەتە .

٧ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێئامراز عادەتەن دەکەوێتە ناوەوەی ڕستەی سەرەکی .

٨ ـ ووشەی تەناسوبی لەو حالەتانەدا بەکارنایەت ، ناوی دیارخراو ، کە رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر راناوی کەسی بێت .

٩ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامراز یەك خاسیەتی هاوبەشیان هەیە ، وەك :

أ ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامراز دەگەڕێنەوە سەر یەکێك لـە بـە شەکانی رستەی سەرەکی ؛ کـە بەرکـارە ، موبتەدایە ، ئاوەڵکارە وەیان دیارخەرە •

ب ـ لە هەردوو رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکاندا راناوی ناوی دیارخراو هەیە •

ج ـ هەردوو جـۆرە رستەی شوێنکەوتووە دیارخەریەکە نـاتوانن بکەونە پێشەوەی رستەی سـەرەکی • هەردووکیـان دەکەونە ناوەوەی یان دەرەوەی رستەی سەرەکی وە هەروەهـا هەردوو تیەکە دەتوانن لە ناوەوەیەوە بینە دەرەوەی •

د ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامراز دەتوانن یەك بەدوای یەك بێنو شوێن یەك بکەون گونجاو نەگونجاوی بنوێنن • وەهەروەها دەشتوانن بگەڕێنەوە سەر جۆرەها بـەش لە بە بەشەکانی رستەی سەرەکی لـەناو رستەیێکی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا •١

هـ ـ هەردوو جـۆرە رستە شوێنکـەوتووە دیارخەرەکـە دەتوانن بگەڕێنەوە سەر رستە شوێنکەوتووەکانی تـر لەنـاو رستەیێکی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا •

و ـ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بەئامرازو بێئامراز یەك بارمان هەیە لەڕووی ئەوەی ، کە هەردووکیان دەتوانن یەك شوێن بە نسبەت رستەی سەرەکیەوەـوەربگرن ، بە تایبـەتی ، کـە ناوی دیارخراو ئاوەڵکار یان بەرکاری نایەکسەرە وەیان دیارخەرە ،

وەیان ڕیستەی سەرەکی ، کە ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەگەڕێتەوە سەر ڕستەیێکی ناڕێك بوو •

١٠- ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بە ئامرازو بێ‌ئامراز بەم شتانەی خوارەوە لێك جیادەبنەوە :

أ ـ ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخـەری بێ‌ئامراز دەتوانێ بەهـۆی ئیزافەت‌و ڕاناوی ناوی دیارخراوەوە بگاتە ڕستەی سەرەکی ؛ بەڵام ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بەئامراز هەر بە ئامرازی گەیەنەر « کە » خۆی دەگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی وە هەندێ جاریش ئیزافەت‌و ڕاناوی ناوی دیارخراو دەوری ئەم گەیاندنـە دەبینن •

ب ـ لەناو ڕستەی سەرەکیدا ، ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخـەری بەس دەگەڕێتەوە سەر ڕاناوی نیشانەی دوورو نزیك نیشاندەر لەگەڵ ئامرازی دیارخەر« ە » بەکاردەهێنرێت لە فۆڕمی ( ئەو ـ ە، ئەم ـ ە ) ئامرازی ناسراو « ەکە »و ڕاناوی ناوی بۆ تاکو « ئەمە ـ ئەمانە ، ئەوەئەوانە » • بەڵام لەگەڵ ڕستەی شوێن‌کەوتووی بەئامرازو بێ‌ئامراز ئەو ووشە تەناسوبیانەی سەرەوە و ئەوەکانی تریش ، کە هاتوون بەکار دەهێنرێن •

ج ـ ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز هەردەم بە دوای ناوی دیارخراوەوە دێت ، کە دەگەڕێتەوە سەری ، بەڵام ڕستەی شوێن‌کەوتووی دیارخـــەری بەئامـراز دەکەوێتە دوای نـاوی دیارخراوەوە بەس لەو حاڵەتەی ، کە ئامرازی گەیەنەر نیە •

د ـ ڕستەی یەك بە دوای یەك هاتووی دیارخەری لـــە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا بەس لـــە جۆری ڕستەی شوێن ـ کەوتووی دیارخەری بەئامرازدا بە دیاردەکەون •

